# ناسینی هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## پۆلی یەکەمی ناوەندی ندا

ناساندنی کتێب: ئەم کتێبە پێکدێت لە ناساندنی ژیانی (20) یاوەری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، کەبەم شێوەیە ریزبەندی بۆ کراوە.

کۆمەڵەی یەکەم: بریتیەلەو (5) یاوەری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە بە پێنج عبدالله کە ناسراون. (العبادلة الخمسة) .

کۆمەڵەی دووەم: بریتیەلە (11) خێزانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

کۆمەڵەی سێیەم: بریتیەلە (4) کچەکەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

ئەم کتێبە لە مەوسوعەیەکی گەورەی ژیانی هاوەڵان دەرهێنراوە کە پێکدێت لە دە بەرگ، مامۆستا (نیهاد جلال) نوسیویەتی، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە بۆ ئەو هەوڵ و ماندوبونەی کێشاویەتی، توانیویەتی هەموو ژیانی هاوەڵان بەکوردی بخاتە بەردەست موسوڵمانانی کوردستان، ئەمەش پڕکردنەوەی بۆشایەکی گەورەیە کە موسڵمانانی کورد زیاتر ئاشنابن بە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

زانکۆی ئازادی دیراساتی ئیسلامی

# عەبدوڵای کوڕی عەبباس(ﷺ)

ناوی عەبدوڵای کوڕی عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیبی کوڕی هاشمی قوڕیشی هاشمیە، کونیەکەی ئەبولعەبباسەو ئامۆزای پێغەمبەری خوا (ﷺ)[8745] و یەکێك لە زانایانی ناو هاوەڵانە.[8746]

## باوکی:

عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیبی کوڕی هاشمی قورەیشی هاشمیە، مامی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و کونیەکەی ئەبولفەضلە، دوو ساڵ پێش لەدایکبوونی پێغەمبەر (ﷺ) لەدایك بوو،[8747] رایەکیش دەڵێت بەڵکو سێ ساڵ لە پێغەمبەر (ﷺ) گەورەتر بوو.[8748] لە پیتی (ع) دا ژیانی عەببासمان باسکردووە.

---

٨٧٤٦ - خوێنەری ئازیز، ئەم هاوەڵە یەکێکە لە دیارترین هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و گەورە موفەسیر و زانای فەرمودە و کەسێتی گەورەو دیاری سەردەمی خۆی بووە، بۆیە بۆ نووسینەوە ژیانی بە سەدان لاپەڕەش هێشتا مافی تەواوی نادات، ئێمە لێرەدا تەنها کورتەیەکمان لە ژیانەکەی هێناوەو دەتوانیت بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە ژیانەکەی، بگەڕێیتەوە بۆ ئەو نووسینانەی تایبەت بە ژیانی نووسراون.

٨٧٤٧ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٦٣١.

٨٧٤٨ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٥.

## دایکی:

دایکی ناوی ئوممولفەضلەو زیاتر بەو کونیەی ناسراوە، هاودەم بە عەبباسی مێردی موسڵمان بوو و ئیمانەکەی شاردەوەو فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوەو فەزڵ و پلەوپایەی گەورەی لای پێغەمبەر (ﷺ) هەبوو، لە خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا کۆچی دوایی کرد.[٨٧٤٩]

## براو خوشکەکانی :

برایەکی هەبوو بە ناوی فەضل کە موسڵمان بوو و دواتر بە تاعوون لە شام وەفاتی کرد، عوبەیدوڵای برای کەسێکی دەوڵەمەند بوو، عەبدورەحمانیان کە لە شام مرد، قثم کە زۆر لە پێغەمبەر (ﷺ) دەچوو و دواتر بۆ جیهاد چوو بۆ خوراسان و لە سەمەرقەند وەفاتی کرد، میعبەد کە دواتر لە ئەفریقیا شەهید بوو، ئوممحەبیبە، کەثیر کە زانایەکی گەورە بوو، تەممام، صەفییە، ئومەیمە، حارث.[٨٧٥٠]

## ژن و منداڵەکانی:

کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبباس کە کوڕە گەورەی بوو و لوبابەی گەورە دایکی بوو.[٨٧٥١]

## لەدایکبوونی:

عەبدوڵای کوڕی عەبباس لە شیوی بەنی هاشم لەدایك بوو، لەدایکبوونەکەشی سێ ساڵ پێش کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بوو بۆ مەدینە،[٨٧٥٢] واتە دە ساڵ پاش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، ئەوکات هێشتا گەمارۆی سەر هاشمیەکان لانەبرابوو،[٨٧٥٣] واتە لە گەرمەی ئابلۆوقەی قورەیشیەکان بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) و موسڵمانان لەدایك بوو.

---

٨٧٤٩ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ٢٧٦.

٨٧٥٠ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٦.

٨٧٥١ - أسد الغابة، ج٣، ص ٢٩٥.

٨٧٥٢ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٣٢.

٨٧٥٣ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٣٥.

ئیبن عەبباس لە مەککە لە نزیك دایك و باوکیەوە گەورە بوو، هەر لەوێ مایەوە تا لە فەتحی مەککەوە چوویە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و ماوەی (٣٠) سی مانگ لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بوو.[٨٧٥٤]

بەڵام موسڵمانبوونی ئیبن عەبباس پێشتر بوو، ئەمەش بە چەند بەڵگەیەك، لەوانە: ئیبن عەبباس دەڵێت من و دایکم لە کەسە بێدەسەڵاتەکانی مەککە بووین، من لە منداڵان بووم و دایکیشم لە ئافرەتان بوو.[٨٧٥٥]

ئەبوورافیعی خزمەتکاری عەبباس دەڵێت: من خزمەتکاری عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب بووم و من موسڵمان بووبووم، ئوممولفەضلی ژنی عەبباس و خودی عەبباسیش موسڵمان بووبوون، بەڵام عەبباس موسڵمانبوونەکەی خۆی دەشاردەوە.[٨٧٥٦]

جا موسڵمانبوونی دایك و باوکی عەبدوڵا، بەڵگەیەکی روونە کە ئەو بانگەوازەشیان گەیاندووە بە منداڵەکانیان.

## ئیبن عەبباس لە پاش فەتحی مەککە

ئیبن عەبباس دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) منی گوشی بە خۆیدا و فەرمووی(خوایە شارەزای بکە لە قورئان)،[٨٧٥٧] لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە دەڵێت فەرمووی(خوایە دانایی فێر بکە).[٨٧٥٨]

ئیبن عەبباس دەڵێت جارێك پێغەمبەر (ﷺ) چوو دەست بەئاو بگەیەنێت، منیش ئاوم بۆ برد، دواتر کە هاتە دەرەوە، فەرمووی کێ ئەوەی دانا؟ پێی وترا من بوم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی(اللهم

٨٧٥٤ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٣٢.

٨٧٥٥ - صحيح البخاري، الرقم ١٣٠٣.

٨٧٥٦ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٣٧٥، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٣٢٢٥، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

٨٧٥٧ - صحيح البخاري، الرقم ٧٥،

٨٧٥٨ - صحيح البخاري، الرقم ٣٥٦٧، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٦٣، سنن الترمذي، الرم ٣٨٤٢، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٩٠٩.

**فقهه فى الدين)،[٨٧٥٩] (خوایه تێگەیشتووی بکەیت لە ئاییندا)، لە گێڕانەوەیەکی تردا هەروەها فەرمووی (خوایه فێری تەئویلی بکە).[٨٧٦٠]**

**جارێك رەبیعه هاودەم بە عەبباسی مامی پێکەوە قسەیان دەکرد، وتیان خۆزگە ئەم دوو کوڕەی خۆمان دەنارد، واتە (عەبدوڵای کوڕی عەبباس و عەبدولموطەلیبی کوڕی رەبیعە) بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) تا سەرپەرشتی کۆکردنەوەی ئەو زەکاتەی بسپاردایە بەوان، ئیتر خەڵکی چی دەستکەوتایە ئەوانیش دەستیان دەکەوت و خەڵکی چی ببەخشیایە ئەوانیش دەیانبەخشی لەو کاتەدا عەلی کوڕی ئەبوو طالیب هات و ئەوانیش مەسەلەکەیان بۆ باس کرد، عەلی وتی شتی وا مەکەن چونکە سوێند بەخوا پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە ناکات، بەڵام رەبیعە کەناری گرت لێی و پێی وت بەخوا لە حەسوودیتەوەیە وا دەڵێیت، تۆ بوویت بە زاوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە حەسوودیمان پێ نەبردیت، عەلی وتی دەی بیاننێرن، ئینجا عەلی راکشا، ئەوەبوو ئەو دوانە چوون، دوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی کرد عەبباس و هاوڕێکەی چوون بۆ ژوورەکەی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەوەی لە ناختاندایە دەریبڕن)، ئەوکات پێغەمبەر (ﷺ) لەماڵی زەینەبی کچی جەحش بوو، عەبدولموطەلیب دەڵێت: هەریەکەمان چاوەڕێ بووین ئەوی ترمان قسە بکات، دواجار یەکێکمان قسەی کرد و وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ چاکترین و خزم دۆستترین کەسیت، بیستوومانە هاوسەرگیریت کردووە، جا هاتوین تا هەندێ لە کۆکردنەوەی زەکات بسپێریتە دەستمان، ئیتر ئێمەش وەك ئەو خەڵکە ماف و ئەرکەکان بەجێ دەگەیەنین، پێغەمبەر (ﷺ) ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو و لەولاشەوە زەینەبی خێزانی بە ئاماژەی چاو پێی دەوتین هیچی پێ مەڵێنەوە، دواتر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إن الصدقة لا تنبغي لآل محمد إنما هي اوساخ الناس)،[٨٧٦١] (زەکات بۆ بنەماڵەی موحەممەد رەوا نیە، بەڵکو زەکات پاشماوەی چڵکی دەستی خەڵکە).**

**ئیبن عەبباس دەڵێت شەوێك لە ماڵی مەیموونەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) مامەوە کە پوورم بوو، راکشام و پێغەمبەریش (ﷺ) راکشا، لە نیوەی شەودا لە خەو هەستاو بە دەستەکانی خەوی لە چاوانی دەتۆراند، دواتر دە ئایەتی کۆتای سورەتی ئالی عیمرانی خوێند، دواتر هەستاو دەستنوێژی**

---

٨٧٥٩ - صحيح البخاري، الرقم ١٤٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٦٤.

٨٧٦٠ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٦٤، صححه الذهبي في التلخيص، كما صححه أحمد شاكر، كما صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٢٥٨٩،

٨٧٦١ - صحيح مسلم، الرقم ١٨٤٩.

گرت و دەستی کرد بە نوێژ کردن، منیش چەشنی ئەوم کرد، دواتر لە کەناریەوە وەستام، دەستی راستی خستە سەر سەرم و بە دەستی گوێی راستی گرتم و دەیپرواند، دوانزە رکات نوێژی کرد، دواتر یەك رکاتی کرد، دواتر راکشا تا بانگبێژ هات، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) هەستا و دوو رکاتی کورت نوێژی کرد، ئینجا نوێژی بەیانی کرد.[٨٧٦٢]

ئیبن عەبباس دەڵێت جارێك لەگەڵ باوکم لای پێغەمبەر (ﷺ) بووین، کابرایەك لای پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە پێکەوە قسەیان دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) پشتی کردبوو لە باوکم، لەلای چووینە دەرەوەو باوکم پێی وتم کوڕی شیرینم بینیت ئامۆزاکەت چۆن پشتی تێکردبووم؟ منیش وتم باوکە گیان، ئەو کابرایەکی لابوو پێکەوە قسەیان دەکرد، ئەوەبوو گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، باوکم وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاواو ئاوام وت بە عەبدوڵا و ئەویش پێی وتم کە تۆ کەسێکت لا بووەو قسەی لەگەڵ کردویت، مەگەر تۆ کەست لابوو؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی عەبدوڵا ئایا تۆ ئەوت بینی؟ وتم بەڵێ، فەرمووی(دەی ئەوە جیبریل بوو، بەهۆی ئەوەوە ئاگاداری تۆ نەبووم).[٨٧٦٣]

ئیبن عەبباس دەڵێت کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش کەوت و ئازارەکەی زیادی کرد، فەرمووی(پەڕەیەکم بۆ بهێنن تا نووسراوێکتان بۆ بنووسم تا دوای ئەوە گومڕا نەبن)، عومەری کوڕی خەططاب وتی پێغەمبەر (ﷺ) ئازار زۆری بۆ هێناوە، هاوکات کتێبی خوا لەنێوماندایە بەسمانە، ئیتر قسەو مشتومڕ لەنێو هاوەڵاندا زۆر بوو تا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی(قوموا عنی ولا ینبغی عندی التنازع)،[٨٧٦٤] (لەلام هەستن و بڕۆن، شیاو نیە لای مندا ناکۆکی هەبێت)، ئیبن عەبباس کە ئەم فەرموودەی دەگێڕایەوە دەیوت رۆژی پێنج شەممە بوو، ئینجا دەستی کرد بە گریان و زۆر گریا.[٨٧٦٥]

ئیبن عەباس دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی نەخۆشیەکەیدا بە پارچە قوماشێك سەری بەستبوو، چوویە سەر مینبەر و سوپاس و ستایشی خوای کرد و دواتر فەرمووی(إنە لیس من الناس أحد أمن علي في نفسه وماله من أبي بكر بن أبي قحافة، ولو كنت متخذا من الناس خليلا لاتخذت أبا بكر

---

٨٧٦٢ - صحيح البخاري، الرقم ١١٥٥، صحيح مسلم، الرقم ١٣١٥.

٨٧٦٣ - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٢٤٦٧، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٠٣٨٥، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٥٨٢، صححه أحمد شاكر، كما صححه شعيب الأرناؤوط.

[٨٧٦٤] - صحيح البخاري، الرقم ١١٣.

[٨٧٦٥] - صحيح مسلم، الرقم ٣١٧٤.

خليلا، ولكن خلة الإسلام أفضل، سدوا عني كل خوخة في هذا المسجد، غير خوخة أبي بكر)،[٨٧٦٦] (کەس نیە بەهۆی گیان و سامانیەوە منەتباری بم جگە لە ئەبووبەکری کوڕی قوحافە، ئەگەر من دۆستی زۆر نزیکم لەنێو خەڵکدا بگرتایە، بە دڵنیایەوە ئەبووبەکر دەبوو، بەڵام هاودەمی ئیسلام باشترە، لەم مزگەوتەدا چی خێمە هەیە بەروومدا دایخەن جگە لە خێمەکەی ئەبووبەکر).

عومەری کوڕی خەططاب لە ماوەی خیلافەتی خۆیدا ئیبن عەبباسی زۆر لە خۆی نزیك رادەگرت و زۆر راوێژی پێدەکرد و رای ئەوی زۆر لا گرنگ بوو، ئەوەبوو جارێك هەندێ لە کۆچەران گلەییان لێکرد کە بۆچی ئیبن عەبباس لەوان زیاتر لە خۆی نزیك دەکاتەوە، عومەری کوڕی خەططابیش وتی ئەمڕۆ نیشانتان دەدەم بۆچی وا دەکەم، ئەوەبوو سەبارەت بە تەفسیری ئایەتێك پرسیاری کرد لەوان، وەلامێکیان دایەوە، پرسیارەکە سەبارەت بە سوورەتی(إذا جاء نصر الله) بوو، ئەوانیش وتیان خوا فەرمانی کردووە بە پێغەمبەر (ﷺ) کە بینی خەڵك دەستە دەستە دێنە ناو ئایینی خوا، سوپاسی خوا بکات و داوای لێخۆشبوونی لێ بکات، ئینجا عومەر وتی ئیبن عەبباس تۆ قسە بکە، ئەویش وتی خوا بەو سوورەتە بە پێغەمبەری خوای(ﷺ) گەیاند کە کاتی مردنیەتی و با ئیتر سوپاسی خوا بکات و داوای لێخۆشبوونی لێ بکات.[٨٧٦٧]

ئیبن عەبباس لە سەردەمی هەریەك لە عومەری کوڕی خەططاب و عوثمانی کوڕی عەففانیشدا فەتوای دەدا بۆ خەڵك.[٨٧٦٨]

ئیبن عەبباس لە ناو سوپاکەی عەبدوڵای کوڕی سەعددا بەشداری فتووحاتی ئەفریقیای کرد.[٨٧٦٩]

خەڵکی مەدینە داوایان کرد ئیبن عەبباس سەرپەرشتی حەجیان بکات، ئەویش چوو بۆ لای خەلیفە عوثمانی کوڕی عەففان و خەلیفەش رایسپارد بۆ ئەو کارە، تا ئیبن عەبباس چوو حەجەکەی کرد و هاتەوە، دەبینێت خەلیفە کوژراوە.[٨٧٧٠]

---

[٨٧٦٦] - صحيح البخاري، الرقم ٤٥٧، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٩٧٠، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٨٣٤، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٣٣٧، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٢٥٢٨، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١١٧٢٣.

٨٧٦٧ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٤٣.

[٨٧٦٨] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٩٩.

٨٧٦٩ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٣٦.

٨٧٧٠ - سير أعلام النبلاء، ٣، ص ٣٤٩.

# ئیبن عەبباس لە خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا

کاتێك عەلی کوڕی ئەبووطالیب بوو بە خەلیفە، ئیبن عەبباسی کرد بە والی شام و وتی بڕۆ بۆ ئەوێ، بەڵام ئیبن عەبباس رازی نەبوو و وتی ئەگەر موعاویە نەمکوژێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە بەندم دەکات، پاشان بە عەلی وت موعاویە بکە بە کاربەدەستی خۆت و دواتر لایبەرە، بەڵام عەلی بەو رایەی ئیبن عەبباس رازی نەبوو.[٨٧٧١]

ئیبن عەبباس هەوادار و پاڵپشتی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبووطالیب بوو، هەروەها لە جەنگی جەمەلدا بەشداری کرد، ئیبن عەبباس دەڵێت لە جەنگی جەمەلدا بە زوبەیرم وت ئەرێ هاتویت لەگەڵ کوڕی عەبدولموتەلیبدا بجەنگیت؟ ئیتر زوبەیر گەڕایەوە، کەچی ئیبن جرمووز خۆی گەیاند پێی و کوشتی، دواتر ئیبن عەبباس هات و پرسیاری کرد لە عەلی ئەرێ بکوژەکەی زوبەیر سەرەنجامی بەرەو کوێیە؟ عەلی وتی دۆزەخ.

لە پاش جەنگی جەمەل خەلیفە ئیبن عەبباسی کرد بە والی بەصرە تا کاتی جەنگی صفین هات، ئەوکات ئیبن عەبباس چوو بەشداری تێدا کرد و بەشی راستی سوپاکەی عەلی بە دەست ئەوەوە بو، دوای جەنگەکەش سەرلەنوێ بوویەوە بە والی بەصرە.[٨٧٧٢]

هەروەها ئیبن عەبباس لە جەنگی خەواریجەکانیشدا بەشداری کرد و پاڵپشتێکی گەورەی عەلی کوڕی ئەبووطالیب بوو.[٨٧٧٣]

کاتێك ئیبن عەبباس لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا ئەمیری بەصرە بوو، ئەبوو ئەیووب چوو بۆ ئەوێ و چوو بۆ لای، ئیبن عەبباسیش زۆر رێزی لێنا و وتی بە دڵنیاییەوە دەبێت پاداشتی ئەو رێزگرتنەت بدەمەوە کە بەرامبەر بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەنجامت دا، بۆیە چی شتێك لەناو ماڵەکەیدا هەبوو دای بە ئەبوو ئەیووب.[٨٧٧٤]

---

[٨٧٧١] - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٥٣.

٨٧٧٢ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٥٣.

[٨٧٧٣] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٩٩.

٨٧٧٤ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٠٤.

ئیبن عەبباس را زانستیەکانی خۆی بەرامبەر بە هەڵوێستەکانی عەلی کوڕی ئەبووطالیب دەخستەڕوو و هەندێ هەڵەشی بۆ ڕاست دەکردەوە، عەلیش ڕاکانی ئەوی بە هەند وەردەگرت.[٨٧٧٥]

## ئیبن عەبباس لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیاندا

پاش وەفاتی عەلی کوڕی ئەبووطالیب، موعاویە یەزیدی نارد بۆ لای ئیبن عەبباس بۆ سەرەخۆشی لە وەفاتی عەلی کوڕی ئەبووطالیب، دواتر ئیبن عەبباس چوو بۆ لای موعاویە، موعاویەش ڕێزێکی زۆری گرت و سەبارەت بە مەرگی عەلیش سەرەخۆشی لێکرد و ئەوپەڕی خەمباری خۆی بۆ نواند، ئیبن عەبباسیش سوپاسی هەڵوێستەکەی کرد.[٨٧٧٦]

ئیبن عەبباس لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا ڕێز و خۆشەویستیەکی زۆری هەبوو، جارێك موعاویە چوو بۆ حەج وئیبن عەبباسیشی لەگەڵ بوو، کە خەڵکەکە زانییان ئیبن عەبباسی لێیە، نیوەی جەماوەر لە کاروانی ئیبن عەبباسدا بوون و نیوەی تریان لە کاروانی موعاویەدا بوون، چونکە خەڵکەکە دەیانویست زانست لە ئیبن عەبباس وەربگرن.[٨٧٧٧]

جارێك ئیبن عەبباس ڕەشۆی ولاخەکەی زەیدی گرت ، زەید وتی کەنار بگرە ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەویش وتی ئێمە بەرامبەر زاناو گەورەکانمان وادەکەین.[٨٧٧٨]

ئیبن عەبباس لە سەردەمی موعاویەدا لە بەصرە بوو، ئەبووئەییووبی ئەنصاری چوو بۆ لای و سکاڵای قەرزاری خۆی کرد، ئیبن عەبباس وتی ئەوەی تۆ کردت بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، من لەگەڵ تۆ دەیکەم، ئەوەبوو ماڵەکەی خۆی چۆڵکرد بۆ ئەبووئەییووب و دوو هێندەی قەرزەکەی پارەی پێدا تا قەرزەکەشی بداتەوەو هێندەشی بۆ بمێنێتەوە.[٨٧٧٩]

ئیبن عەبباس لە کاتی ئەسپەردەکردنی زەیدی کوڕی ثابتدا وتی ئاوایە مەرگی زانایان، ئەمڕۆ زانستێکی زۆر ژێر گڵ نرا.[٨٧٨٠]

---

[٨٧٧٥] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٠٠.

[٨٧٧٦] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٠٠.

٨٧٧٧ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٥١.

٨٧٧٨ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٣٧.

[٨٧٧٩] - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٥٢.

٨٧٨٠ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤٠.

له کاتی ئەسپەردەکردنی زەیدی کوڕی ثابتدا ئەبووهوڕەیرە وتی ئەمڕۆ مەرەکەبی ئەم ئوممەتە(زانای ئوممەت) مرد بەڵکو خوای گەورە ئیبن عەبباس بکاتە جێگرەوەی.[٨٧٨١]

کاتێك موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان ویستی بەیعەت بۆ یەزیدی کوڕی وەربگرێت تا دوای خۆی شوێنی بگرێتەوە، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر بەیعەتی نەدا، هەریەك لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبووبەکر و عەبدوڵای کوڕی عومەر و حوسەینی کوڕی عەلی و عەبدوڵای کوڕی عەبباسیش بەیعەتیان نەدا،[٨٧٨٢] بەڵام موعاویە بە نابەدڵی بەیعەتی وەرگرت لێیان، بەڵام دواتر کە موعاویە مرد حوسەین و عەبدوڵا بەیعەتیان نەدا بە یەزید.[٨٧٨٣]

## هەڵوێستی ئیبن عەبباس لە شۆڕشەکەی حوسەینی کوڕی عەلیدا

کاتێك موعاویە مرد و یەزید نامەی نارد بۆ وەلیدی کوڕی عوقبە کە والی مەدینە بوو، تا بەیعەتی بۆ وەربگرێت، وەلید ناردی بە شوێن حوسەینی کوڕی عەلی و ئیبن زوبەیردا، هێشتا شەو بوو، داوای کرد لە هەردووکیان بەیعەت بدەن بە یەزید، ئەوانیش وتیان با ڕۆژ بێتەوە بزانین خەڵکی چی دەکەن، هەر ئەو شەوە لە مەدینە دەرچوون بەرەو مەککە، کە گەیشتنە ئەوێ حوسەین لەماڵی عەبباس دابەزی، ئیبن عەبباس بەردەوام ڕێگری دەکرد لە چوونی حوسەین بۆ عێراق و دەیوت کاری وا نەکەیت.[٨٧٨٤]

حوسەین هەر کە چوو بۆ لای ئیبن عەبباس سەبارەت بەو کارەی ڕاوێژی پێکرد، لە وەڵامدا ئیبن عەبباس ڕای وابوو کاری وا نەکات چونکە مەرگی ئەوی لێدەکەوێتەوە، بەڵام حوسەین پێی وت مەرگم لا خۆشترە لەوەی بەو بارە ڕازی بم.[٨٧٨٥]

---

٨٧٨١ - أسد الغابة، ج٢، ص ٣٣٣.

٨٧٨٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٧٩.

٨٧٨٣ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩١-٢٩٢.

٨٧٨٤ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٥.

٨٧٨٥ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٢.

ئینجا ئیبن عەبباس پێی وت کوڕی فاطیمە بۆ کوێ دەچیت؟ وتی دەچم بۆ عێراق بۆ لای هەوادارنم، ئەویش وتی پێم خۆش نیە ئەم دەموچاوەی تۆ بچێت بۆ لای خەڵکێك کە باوکتیان کوشت، ئینجا زۆر قسەی بۆ کرد.[8786]

پێی وت ئەگەر ئەو خەڵکەی کە داوایان لێکردویت بچیت بۆ لایان ئەمیرەکەی ئێستایان کوشتووەو باری وڵاتیان ڕێکخستووەو دوژمنیان دەرکردووە ئەوە بڕۆ بۆ لایان، بەڵام ئەگەر لە کاتێکدا بانگت دەکەن کە هێشتا ئەمیرەکەیان ماوەو کاربەدەستانی سەرقاڵی سامان وەرگرتنن لە خەڵکی وڵاتەکە، ئەوە تەنها تۆ بۆ جەنگ بانگ دەکەن و منیش هیچ دڵنیا نیم لەوەی لەخشتەت نەبەن و لە قسەت دەرنەچن و پشتت بەرنەددەن و لە دژت نەجەنگن و ببنە سەرسەختترین دوژمن بۆت، حوسەینیش وتی نوێژی ئیستیخارە دەکەم بزانم چۆن دەبێت.[8787]

ئیبن عەبباس هەر خۆی پێ ڕانەگیرا و بۆ بەیانیەکەی هاتەوە بۆ لای  وتی ئامۆزا گیان زۆر خۆم ڕاگرت بەڵام خۆم پێ ڕاناگیرێت و ئارامم بڕاوە، من زۆر دەترسم بەم کارەت لەناو بچیت، چونکە خەڵکی عێراق ناپاکن، لێیان نزیك مەبەرەوەو لەم خاکەدا بمێنەرەوە، تۆ سەییدی خەڵکی حیجازیت، ئەگەر خەڵکی عێراق ڕاست دەکەن تۆیان دەوێت نامەیان بۆ بنێرە داوا بکە تا بەرپرسەکەیان دووربخەنەوەو دواتر بڕۆ بۆ لایان، ئەگەر ئەوەش ناکەیت دەی بڕۆ بۆ یەمەن چونکە لەوێ قەڵا و شیوی لێیەو خاکێکی فراوان و گەورەیە و هەوادارانێکی باوکیشت لەوێن و دووریت لەو خەڵکەو لەوێوە پەیام و بانگخوازانت بڵاو بکەرەوە، پێم وایە ئەمەت بۆ باشترە، بەڵام حوسەین وتی ئامۆزا گیان دەزانم تۆ دڵت بۆم دەسووتێت و ئامۆژگاریم دەکەیت، بەڵام من خۆم پێچاوەتەوەو یەکلا بوومەتەوە کە بچم، ئیبن عەبباس وتی دەی هەر دەڕۆیت ژن و منداڵەکانت مەبە، دەترسم وەك چۆن عوثمان کوژرا تۆش ئاوا لەناو ژن و مناڵەکانتا بکوژرێیت و ئەوانیش تەماشا بکەن.[8788]

---

٨٧٨٦ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٦.

٨٧٨٧ - الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٣٩٩.

٨٧٨٨ - الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤٠٠-٤٠١.

# ئیبن عەبباس لە سەردەمی دەسەڵاتی عەبدوڵای کوڕی زوبەیردا

پاش مردنی یەزید و هاتنی موعاویەی کوڕی کە پیاوێکی خواناس بوو و کەم ژیاو وەفاتی کرد و کەسی لە دوای خۆی دیاری نەکرد، ئیتر بۆشاییەك لە دەسەڵاتدا دروست بوو، ئەمە دەرفەتێکی باش بوو بۆ عەبدوڵای کوڕی زوبەیر تا بەیعەتی پێ بدرێت و ببێتە خەلیفە، گرنگتر لە هەمووی موعاویەی کوڕی یەزید پێش مەرگی خۆی بەیعەتی بۆ هیچ کەس وەرنەگرت.[٨٧٨٩]

عەبدوڵای کوڕی زوبەیر لە مەککەوە خیلافەتی ڕاگەیاند و موسڵمانان کەوتنە بەیعەتدان پێی، چەند کەسێك لەو نێوەندەدا بەیعەتیان پێ نەدا، عەبدوڵا ئومەویەکانی لە حیجاز دەرپەڕاند و هەموانیان بەرەو شام ڕایانکرد.[٨٧٩٠]

ئەوانەی بەیعەتیان پێ نەدا بریتی بوون لە عەبدوڵای کوڕی عومەرو عەبدوڵای کوڕی عەبباس و ئیبنولحەنەفیە.[٨٧٩١]

هەریەك لە ئیبن عەبباس و ئیبنولحەنەفیە بە ژن و منداڵ و کەسانیانەوە چوون بۆ مەککەو لەوێ مانەوە، ئیبن زوبەیر داوای کرد بەیعەت بدەن، ئەوانیش وتیان بەیعەتت پێ نادەین و خۆت سەرقاڵی کاری خۆت بە، هاوکات نە دژایەتی تۆ دەکەین و نە دژایەتی بەرامبەرت دەکەین، بەڵام ئیبن زوبەیر زۆری دەکرد لێیان تا بەیعەت بدەن، کار گەیشتە ئەوەی دەیوت بەخوا یان دەبێت بەیعەت بدەن، یان دەتانسووتێنم.[٨٧٩٢]

دوای ئەوەی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر ژمارەیەك لە هاشمیەکانی بەند کردبوو و بە هەوڵی موختار ئازاد کران، لەنێویاندا عەبدوڵای کوڕی عەبباسیش هەبوو، ئەوەبوو پاش ماوەیەك عەبدوڵا کۆچی دوایی کرد و بەیعەتی هیچ کەسی لە گەردن نەبوو.[٨٧٩٣]

عەبدوڵا لە ڕێی کۆچی هاشمیەکاندا لە ناوچەی طائیف کۆچی دوایی کرد، ئەمەش لە ساڵی شەست و حەوت یان شەست و هەشتی کۆچیدا بوو،[٨٧٩٤] ئەوکاتیش تەمەنی لە سەروو حەفتا ساڵانەوە

---

٨٧٨٩ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٣٨.

٨٧٩٠ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٩، ص ٦٣.

٨٧٩١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٣٩.

٨٧٩٢ - سير أعلام النبلاء، ٣، ص ٣٥٦.

٨٧٩٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٠٦.

بوو، رای راستتر ئەوەیە تەمەنی حەفتاو دوو ساڵ دەبوو، ئیبنولحەنەفیە نوێژی لەسەر ئیبن عەبباس کرد.[٨٧٩٥]

ئیبن عەبباس کەسێکی بەخۆ و کەڵەگەت بوو، زۆر کەشخە بوو، خەنەی بەکاردەهێنا، جلی جوانی دەپۆشی و زۆر بۆنی خۆشی بەکاردەهێنا، ڕەنگی سپی بوو.[٨٧٩٦]

عەبدوڵای کوڕی عەبباس زۆر ڕێزی هاوەڵانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لابوو، ئەوانیش زۆر ڕێزیان لێدەگرت.

ئیبن عەبباس دەڵێت جار هەبوو بۆ یەك بابەت پرسیارم لە (٣٠) هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد.[٨٧٩٧]

کاتێك ئیبن عەبباسی گەورە هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، ڕافیع زۆر پێی کاریگەر بوو، دەیوت ئەمڕۆ کەسێك مرد کە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا پێویستیان بە زانستەکەی بوو.[٨٧٩٨]

موجاهید دەڵێت ئێمە لای خەڵك شانازیمان دەکرد بە چوار کەسەوە، بە فیقهناسەکەمانەوە ئیبن عەبباس،...[٨٧٩٩]

ئیبن عومەر دەیوت ئیبن عەبباس حیبری ئەم ئوممەتەیە،[٨٨٠٠] ئیبنولحەنەفیەش هەمان شتی دووبارە دەکردەوە.[٨٨٠١]

عومەری کوڕی خەططاب بە ئیبن عەبباسی دەوت: بەراستی تۆ زانستێك فێر بویت کە ئێمە نایزانین.[٨٨٠٢]

---

[٨٧٩٤] - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٥٨-٣٥٩.

[٨٧٩٥] - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٠٦.

٨٧٩٦ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٠٦.

٨٧٩٧ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٤٤ و قال الذهبي إسناده صحيح.

٨٧٩٨ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٣٧٢.

٨٧٩٩ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص٤٤٥.

٨٨٠٠ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٣٩.

٨٨٠١ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٣٠٨.

٨٨٠٢ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٤٥.

ئیبن عەبباس دەیوت: هەر ناخۆشیەکم لە برایەکی موسڵمانم بەدی بکردایە، یەکێك لەم سێ ئەگەرانەم بۆ دادەنا، ئەگەر لە سەروو خۆمەوە بوایە، ئەوە پلەو پایەکەیم لەبەرچاو دەگرت، ئەگەر هاوتای خۆم بوایە، زیاتر گەورەم رادەگرت، ئەگەریش لە خواروی خۆمەوە بوایە گوێم پێ نەدەدا، ئەوە رێی ژیانی منە، کێ حەزی پێ ناکات، ئەوە زەوی خوا فراوانە.[٨٨٠٣]

٨٨٠٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٩، ص ٣١٦.

٨٨٠٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤،ص ١٦١.

٨٨٠٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٦١.

٨٨٠٦ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٦٢.

# عەبدوڵای کوڕی عومەر(ﷺ)

ناوی عەبدوڵای کوڕی عومەری کوڕی خەططابی قورەیشی عەدویە، کونیەکەی ئەبووعەبدوڕەحمانە،[٩٠٢٥] یەکێکە لە گەورە هاوەڵە ناسراوەکان و لە زانا گەورەکانی ناو هاوەڵان کە زانستێکی کەموێنەی هەبووە.

باوکی ناوی عومەری کوڕی خەططابەو یەکێکە لە هاوەڵانی زۆر نزیکی پێغەمبەر (ﷺ) و موژدەپێدراوی بەهەشت و دووەم خەلیفەی موسڵمانان پاش ئەبووبەکری صدیق.

دایکی ناوی زەینەبی کچی مەظعوونی کوڕی حەبیبەیە، ئەم ئافرەتە لەگەڵ عومەری کوڕی خەططابدا کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەوەش هاتووە گوایە پێش کۆچکردن بۆ مەدینە مردبێت راست نیە.[٩٠٢٦]

منداڵەکانی بریتی بوون لە دوانزە کوڕ وچوار کچ، ئەبووبەکر و ئەبووعوبەیدەو عەبدولا و عومەر و حەفصەو سەودە کە دایکیان صەفیەی کچی ئەبی عوبەید بوو، عەبدوڕەحمان کە دایکی ناوی ئوممو عەلقەمەی کچی عەلقەمە بوو، سالم و عوبەیدولا و حەمزە کە دایکیان ئومموەلەد بوو، زەید و عائیشە کە دایکیان ئومموەلەد بوو، بیلال کە دایکی ئومموەلەد بوو، ئەبووسەلەمەو قلابە کە دایکیان ئومموەلەد بوو.[٩٠٢٧]

عەبدولا هەر لە تەمەنی منداڵیەوە لە مەککە موسڵمان بوو، دواتر هاودەم بە باوکی کۆچی کرد بۆ مەدینەو هێشتا نەگەیشتبوویە تەمەنی باڵغی، بۆیە نەیتوانی لە غەزای بەدر و ئوحوددا بەشداری بکات و یەکەم غەزا کە تیایدا بەشداری کرد غەزای خەندەق بوو.[٩٠٢٨]

لە غەزای بەدردا بەرائی کوڕی عازب ویستی بەشداری جەنگەکە بکات، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) رێی نەدا هەریەك لە بەرائی کوڕی عازبو ئیبن عومەر بەشداری بکەن لەبەر کەمی تەمەنیان.[٩٠٢٩]

---

٩٠٢٥ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ٢٠٤.

٩٠٢٦ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٨٠.

٩٠٢٧ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١٤٣.

٩٠٢٨ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ٢٠٤.

٩٠٢٩ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص٣٦٧.

زەید دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) لە جەنگی ئوحوددا هەندێ کەسی بە بچووك دانا بۆ بەشداری لە جەنگەکەو هەموویانی گێڕایەوە، ئەوانیش بریتی بوون لە زەیدی کوڕی جاریە–واتە خۆی– و بەرائی کوڕی عازب و زەیدی کوڕی ئەرقەم و ئەبووسەعیدی خودری و عەبدوڵای کوڕی عومەر و جابیری کوڕی عەبدوڵا.[9030]

ئیبن عومەر دەڵێت بۆ غەزای ئوحود کە تەمەنم چواردە ساڵان بوو پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتی نەدا بەشداری بکەم، بەڵام بۆ غەزای خەندەق کە تەمەنم پانزە ساڵان دەبوو مۆڵەتی دام.[9031]

بەپێی گێڕانەوەیەکی واقیدی هاتووە یەکەم غەزا کە هەریەك لە ئیبن عومەر و بەرائی کوڕی عازب تیایدا بەشدار بوون بریتی بووە لە غەزای خەندەق.[9032]

ئیبن عومەر لە حودەیبیەدا بەشداری کردو یەکێك بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی ریضوان.[9033]

هەروەها ئیبن عومەر لەناو سوپاکەی جەعفەری کوڕی ئەبووطالیبدا بەشداری جەنگی موئتەی کرد.[9034]

ئیبن عومەر لە فەتحی مەککەشدا بەشداری کرد.[9035]

جارێك عەبدوڵای کوڕی عومەر داوای لە عومەری باوکی کرد تا داوای کچەکەی صالحی کوڕی نەححامی بۆ بکات، عومەر وتی ئەو بڕێ هەتیوی هەیەو تا ئەوانە وەستابن کچەکەی نادات بە ئێمە، بۆیە عەبدوڵا چوو بۆ لای زەیدی مامی و وتی مامە داوای کچی فڵانەکەسم بۆ بکە، زەیدیش چوو بۆ لای صاڵەح و وتی عەبدوڵای کوڕی عومەر منی ناردووە بۆ داوای کچەکەت، ئەویش وتی من بڕێ هەتیوم هەیەو ئامادە نیم کچەکەم بدەم بە ئێوەو برازاکانی خۆم لەولا وەستابن، بەڵام دایکی کچەکە حەزی دەکرد کچەکەی بۆ عەبدوڵا بێت، چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەبدوڵای کوڕی عومەر هاتووەتە داوای کچەکەم، کەچی باوکی کچەکەی داوە بە هەتیوێك کە لایەتی و

٩٠٣٠ - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٥٤٨.

٩٠٣١ - صحيح البخاري، الرقم ٢٥٤٢، صحيح مسلم، الرقم ٣٥٦٣.

٩٠٣٢ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٦.

٩٠٣٣ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ٢٠٤.

٩٠٣٤ - أسد الغابة، ج٣، ص ٣٤٨.

٩٠٣٥ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ٢١٠.

بەخێوی دەکات، هێشتا رای کچەکەشی وەرنەگرتووە، پێغەمبەریش (ﷺ) ناردی بە شوێن صالحدا و فەرمووی: (ئەرێ بێ ئەوەی رای کچەکەت وەربگریت داوتە بە شوو؟) وتی بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (أشيروا على النساء في أنفسهن و هي بكر)،[٩٠٣٦] (رای کچەکانتان سەبارەت بە خۆیان وەربگرن).

ئیبن عومەر دەڵێت جارێك خەوم بینی کە پارچەیەك ئاوریشم لە دەستمدایەو بەرەو هەر لایەکی بەهەشتی فڕێ دەدەم، منیش لەگەڵ خۆی رادەکێشێت، خەوەکەم گێڕایەوە بۆ حەفصەی خوشکم، ئەویش گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی(براکەت پیاوێکی صالحە) یان فەرمووی (عەبدوڵا پیاوێکی صاڵحە).[٩٠٣٧]

ئیبن عومەر دەڵێت لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) دەمبینی کەسێك خەوی دەدی، دەیگێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، منیش هیوام وابوو خەوێك ببینم تا بیگێڕمەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، جا من ئەوکاتیش لە مزگەوت دەخەوتم، جارێك لە خەومدا بینیم دوو فریشتە منیان برد بۆ دۆزەخ دەتوت وێنەی گۆڕ بەخڕی دیوار کراوە، خەڵکانێکیشی تێدا بوو کە دەمناسین، منیش دەموت پەنا دەگرم بە خوا لە دۆزەخ، پەنا دەگرم بە خوا لە دۆزەخ، پەنا دەگرم بە خوا لە دۆزەخ، فریشتەیەکی تر گەیشت بەو دوو فریشتەیەو بە منی وت مەترسە، منیش خەوەکەم گێڕایەوە بۆ حەفصە–ی خوشکم–، حەفصەش گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی(عبدوڵا پیاوێکی چاکە ئەگەر بە شەویش نوێژی بکردایە)، سالیم دەڵێت ئیتر دوای ئەوە عەبدوڵا بە شەو زۆر کەم دەخەوت.[٩٠٣٨]

ئیبن عومەر زۆر شوێنەوارەکانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەبەرچاو دەگرت، دەچوو لەو شوێنانە دادەنیشت کە کاتی خۆی پێغەمبەر (ﷺ) لەوێ دانیشتبوو، دەچوو لەو شوێنە نوێژی دەکرد کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی تێدا کردبوو، درەختێك هەبوو کە جارێك پێغەمبەر (ﷺ) لە بنیدا دانیشتبوو، ئیبن عومەر دەچوو ئاوی دەدا بۆ ئەوەی وشك نەبێت.[٩٠٣٩]

---

٩٠٣٦ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٥٤٢، حسنه شعيب الأرناؤوط.

٩٠٣٧ - صحيح البخاري، الرقم ٦٦٣٠، صحيح مسلم، الرقم ٤٦٣١، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٨١، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٤٣، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٣٨٩.

٩٠٣٨ - صحيح البخاري، الرقم ١٠٨٣، صحيح مسلم، ٤٦٣٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٦١٣٥، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٧٩، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٤٣٠٩.

٩٠٣٩ - أسد الغابة، ج٣، ص ٣٤٨.

عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێت جارێك لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بووین، فەرمووی (لە درەختدا دارێك هەیە کە گەڵاکەی ناوەڕێت، نمونەی وەك موسڵمان وایە،پێم بڵێن ئەوە چیە؟) خەڵکی وایانزانی درەختی بیابانە، منیش وتم دارخورمایە، بەڵام لە ناخی خۆمدا هێشتمەوەو شەرمم کرد بیڵێم، هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێمان بڵێ، فەرمووی(ئەوە دارخورمایە) عەبدوڵا دەڵێت منیش بە باوکمم وت کە زانیومەو لە شەرمدا نەموتووە، باوکیشم وتی ئەگەر بتوتایە لام خۆشتر بوو لەوەی ئەوەو ئەوەم هەبوایە.[٩٠٤٠]

ئیبن عومەر دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) ماوەیەك بەر لە مردنی نوێژی عیشای بۆ کردین و دواتر کە سەلامی دایەوە هەستایە سەرپێ و فەرمووی(أرأيتكم ليلتكم هذه فإن على رأس مائة سنة منها لا يبقى على وجه الأرض ممن هو اليوم عليها أحد)،[٩٠٤١] واتە(ئەمشەوتان ئەبینن، لەمشەوەوە تا سەد ساڵی تر لەم سەرزەویەدا یەك کەس نامێنێ کە ئەمڕۆ لەسەریەتی).

هەرچەندە عەبدوڵا کوڕی عومەری کوڕی خەططابی خەلیفەی موسڵمانان بوو، بەڵام هیچ ئیمتیاز و تایبەتمەندیەکی پێنەدرابوو، بەڵکو هەمان مافی پێدرابوو کە بە خەڵکی دی درابوو.

عومەری کوڕی خەططاب کە مووچەی بۆ خەڵك بڕیەوە، بۆ سەلمانی فارسی چوار هەزاری دانابوو، بەڵام بۆ کوڕەکەی خۆی(عەبدوڵای کوڕی عومەر) سێ هەزارو نیوی دانابوو، کابرایەك وتی چۆن دەکرێت بۆ کابرایەکی فارسی چوار هەزار و بۆ کوڕی ئەمیری باوەڕداران سێ هەزار و نیو بێت؟! خەڵکەکە وتیان سەلمان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بەشداری غەزایەك بووە کە ئیبن عومەر تیایدا بەشدار نەبووە.[٩٠٤٢]

زەمەخشەری گێڕانەوەیەکی هێناوە کە لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا کاتێك فتووحاتی فارس کرا، سێ کچی یەزگوردی کوڕی شەهریاری کوڕی کیسرا بە کەنیزەك گیرابوون و هێنران بۆ خەلیفەی باوەڕداران عومەری کوڕی خەتتاب، ئەویش ویستی بیانفرۆشێت، بەڵام عەلی کوڕی

---

٩٠٤٠ - صحيح البخاري، الرقم ١٣٠، صحيح مسلم، الرقم ٥١٣٣، سنن الترمذي، الرقم ٢٨٦٨، مسند أحمدبن حنبل، الرقم ٥٠٩٨.

٩٠٤١ - صحيح البخاري، الرقم ١١٥ و ٥٤٩ و ٥٨٥، صحيح مسلم ٤٧٠٩، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٠٤١، سنن أبو داود، الرقم ٣٨٠٥، سنن الترمذي، الجامع الصحيح، الرقم ٢٢٢٩، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥٦٩٨، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٩٧٦، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٤٤١ و ٥٨٣٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٢٨٨٣.

٩٠٤٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٨٦.

ئەبوو طالیب وتی کچانی پاشاکان نافرۆشرێن، بۆیە پارەی هەموویانی دا و دابەشی کردن لە نێوان حوسەینی کوڕی و موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکر و عەبدوڵای کوڕی عومەردا.[٩٠٤٣]

ئیبن عومەر یەکێك بوو لە بەشداربوانی فەتحی میصر و ماوەیەکیش لەوێ مایەوەو نزیکەی چل کەس لە خەڵکی میصر فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە.[٩٠٤٤]

لەو سوپایەدا کە عەبدوڵای کوڕی ئەبی سەرح سەرکردایەتی دەکرد، هەریەك لە عەبدوڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵای کوڕی زوبەیر بەشدار بون، سوپای جەرجیری پاشای بەربەرەکانیش بە زیاد لە سەد هەزار جەنگاوەرەوە هات، سوپای موسڵمانانیش نزیکەی بیست هەزار جەنگاوەر بوو، لە جەنگەکەدا پاش کوژرانی سەرکردەی بەربەرەکان، بەربەرەکان پەرتەوازە بوون و رایاندەکرد و موسڵمانانیش کەوتنە کوشتن و دیلگیرییان.[٩٠٤٥]

کاتێك عومەری کوڕی خەططاب پێکرا، بە عەبدوڵای کوڕی وت برۆ بزانە کێ منی کوشت؟ ئەویش وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەبوولوئلوئەی کۆیلەی موغیرەی کوڕی شوعبە تۆی کوشت، عومەریش وتی سوپاس بۆ خوا کە مەرگی منی بە دەستی کەسێك نەهێنا کە تاکە سوجدەیەکیشی بردبێت بۆ خوا، ئەی عەبدوڵا برۆ بۆ لای عائیشەو پرسیاری لێ بکە بزانە مۆڵەت دەدات لەلای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبووبەکر ئەسپەردە بکرێم؟[٩٠٤٦]

دواتر پێشنیاز کرا عەبدوڵای کوڕی عومەر بۆ شوێنی خۆی دابنێت، بەڵام عومەر تووڕەبوو و بەوە رازی نەبوو،[٩٠٤٧] ئەوەبو پێش شەهیدبوونی دەستەی شوورای دانا، وتی ئەگەر سێ کەس سێ کەس کەوتن (واتە بوون بە دوو بەشەوە) ئەوە عەبدوڵای کوڕی عومەر بکەن بە دادوەری نێوانیان، ئەگەریش بە دادوەری ئەو رازی نەبوون، ئەوە لەگەڵ ئەو دەستەیە بن کە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف تێدایە.[٩٠٤٨]

---

٩٠٤٣ - ربيع الأبرار للزمخشري، ج١، ص ٢٨١.

٩٠٤٤ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ٢٠٩.

٩٠٤٥ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٥٢.

٩٠٤٦ - الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٢، ص ٤٤٧.

٩٠٤٧ - الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٢، ص ٤٥٩.

٩٠٤٨ - الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٣، ص ٤٦١.

کاتێك عومەر لەسەرەمەرگیدا بوو، سەری لە کۆشی عەبدوڵای کوڕیدا بوو، وتی ئەی عەبدوڵا سەرم بخەرە سەر خۆڵەکە بەڵکو خوای گەورە بەو بارەوە بمبینێت و رەحمم پێ بکات، دواتریش کە مرد، عەبدوڵا یەکێك بوو لەوانەی دابەزیە ناو گۆڕەکەی.[٩٠٤٩]

کاتێك لە خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا ئەبووذەر ئیجتیهادێکی کرد کە خەریك بوو کێشەیەك بنێتەوە، ئیبن عومەر یەکێك بوو لەوانەی ئەو ئیجتیهادەی پێ رەوا نەبوو.

ئەبووذەر پێی وابوو ئەوان لە سوار و جلوبەرگدا زێدەڕۆیی دەکەن، بۆیە لەسەر ئەوە نارەزایی بەرامبەریان دەردەبڕی و سەرکۆنەی دەکردن، دەیویست چی لەو ماڵو سامانەی بەردەستیان هەیە دابەش بکرێت، ئەوەش شتێکی پێویست نەبوو.

ئیبن عومەر و هاوەڵانێکی تریش دەیانوت هەرچیەك زەکاتەکەی بدەیت ئیتر بریتی نیە لە کۆکردنەوەی –زێڕ و زیو–، ئەوەبوو لە شام دەمەقاڵەیەك لەنێوان ئەبووذەر و موعاویەدا روویدا، ئیتر ئەبووذەر هات بۆ مەدینە، خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوە، ئەویش هەمان رێی خۆی دەگرتەبەر–دنیانەویستی و ویستی ئەوەی هەموان بەوجۆرە بن–، عوثمان پێی وت خۆزگە کەنارت بگرتایە، مەبەستی ئەوەبوو تۆ لەسەر رێبازێکیت کە بۆ تێکەڵی خەڵك نابێت، چونکە تێکەڵی مەرجی خۆی هەیە و کەنارگرتنیش مەرجی خۆی هەیە، هەرکەسیش بیەوێت وەك ئەبووذەر بژی دەبێت بە تەنها بژی، یان تێکەڵی خەڵك بکات بەڵام وازبهێنێت خەڵکی لەو بارەدا بژین کە لە شەریعەتدا حەرام نەکراوە، ئەوەبوو بۆ پشتگوێخستنی دنیا، ئەبووذەر بە سەربەرزی چوو بەرەو ناوچەی رەبذە، حاڵی ئەبووذەر باشتر بوو، بەڵام ئەو حاڵە بۆ هەموو خەڵك نابێت، چونکە ئەگەر لەسەر ئەو رێبازە بچوونایە بەدڵنیاییەوە لەناودەچوون، سوپاس و ستایش بۆ خوا کە هەموو حاڵەکانی رێکخستووە.[٩٠٥٠]

کاتێك هێرش کرایە سەر ماڵەکەی عوثمانی کوڕی عەففان و ویستیان بیکوژن، حەسەنی کوڕی عەلی لەگەڵ چەند هاوەڵێکی تردا لە ماڵی عوثمانی کوڕی عەففاندا مایەوە و بەرگری دەکرد، بەڵام عوثمان داوای لێکردن وازبێنن و نەجەنگن،[٩٠٥١] کاتێکیش عوثمان شەهید کرا و ژنەکەی هاورای کرد،

---

[٩٠٤٩] - الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٢، ص ٤٤٨.

٩٠٥٠ - العوصم من القواصم، تحقيق محب الدين الخطيب و محمود مهدي الأستانبولي، ط٢، دار الجيل(بيروت-١٩٨٧)، ص ٨٥- ٨٨.

٩٠٥١ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٤٥٢.

هەریەك لە حەسەن و حوسەین و چەند کەسێکی تر چوونە ژوورەوە، سەیریان کرد عوثمان شەهید کراوە و سەری بڕاوە.[٩٠٥٢]

ئیبنولعەرەبی لەو بارەیەوە دەڵێت:

ئەوەش چەسپاوە کە حەسەن و حوسەین و ئیبن زوبەیر و ئیبن عومەر و مەروان هەموویان بەچەکەوە چوون بۆ ماڵ—بۆ بەرگری کردن لە عوثمان— بەڵام ئەو پێی وتن بڕیارم بۆتان ئەوەیە بگەڕێنەوەو چەکەکانتان دابنێن و لە ماڵی خۆتان بمێننەوە...

عەبدوڵای کوڕی عامری کوڕی رەبیعە دەڵێت: من لەگەڵ عوثمان لە ماڵەوە بووم، وتی بزانە کێ گوێڕایەڵی فەرمانی منە پێی بڵێ دەست و چەکی بگرێتەوەو بەکاری نەهێنێت، پاشان وتی ئەی ئیبن عومەر هەستە—ئەوکات ئیبن عومەر شمشێرێکی بەدەستەوە بوو—بڕۆ ئەو هەواڵە بدە بە خەڵکەکە.

ئیبن عومەر و حەسەنی کوڕی عەلیش چوونەدەرەوەو —ئاشووبگێڕانیش— چوونە ناو ماڵەکەو عوثمانیان کوشت...

حەسەنی کوڕی عەلی کۆتا کەس بوو کە لەلای مابوویەوە، چونکە حەسەن و حوسەین و ئیبن عومەر و ئیبن زوبەیر و مەڕوان هاتبوون بۆ لای، ئەویش زۆر جەختی لێکردنەوە چەکەکانیان دابنێن و بچنەدەرەوەو بچنەوە بۆ ماڵی خۆیان...[٩٠٥٣]

جارێك ئیبن عومەر لەگەڵ خەڵکێکی قورەیشیدا دانیشتبوو، کابرایەکی میصری هات بۆ لای، وتی ئەی ئیبن عومەر پرسیارێکت لێدەکەم وەڵامم بدەرەوە، ئایا دەزانیت عوثمان لە رۆژی ئوحوددا رایکرد؟ وتی بەڵێ، وتی دەزانیت لە بەدردا ئامادە نەبو؟ وتی بەڵێ، وتی دەزانیت لە بەیعەتی ریضواندا ئامادە نەبوو؟ وتی بەڵێ، کابرا وتی الله اکبر، ئیبن عومەر وتی وەرە با بۆت روون بکەمەوە، راکردنی ئوحودی من شایەتی دەدەم کە خوا لێی خۆش بوو، بۆ ئامادە نەبوونی بەدریش لەبەرئەوە بوو کە کچەکەی پێغەمبەر (ﷺ) هاوسەری بوو و نەخۆش بوو، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو تۆ پاداشت و پشکی یەکێك لە ئامادەبوانی بەدرت هەیە، بۆ ئامادەنەبوونیشی

---

٩٠٥٢ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٤٥٩.

٩٠٥٣ - العواصم من القواصم لابن العربي.

له بەیعەتی ریضوان، ئەوە ئەگەر لەناو مەککەدا بڵندپایەتر لە عوثمان هەبوایە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی لەبری عوثمان دەنارد، پێغەمبەر (ﷺ) عوثمانی نارد و بەیعەتەکە دوای ئەوە بوو کە عوثمان چوو بۆ مەککە، لە کاتی بەیعەتەکەدا پێغەمبەر (ﷺ) دەستی راستی نیشان دا و فەرمووی ئەوە دەستی عوثمانە، دەستی راستی دا بەسەر دەستەکەی تریدا و فەرمووی(ئەوە بۆ عوثمان)، ئینجا ئیبن عومەر بە کابرای وت دەی ئێستا برۆ.[٩٠٥٤]

ئیبن عومەر لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بەشداری هیچ جەنگێکی نەکرد و و کەناری گرت، بەڵام دواتر لە دواییەکانی تەمەنیدا پەشیمانی دەردەبڕی کە چۆن پشتیوانی عەلی کوڕی ئەبووطالیبی نەکرد لەو جەنگانەدا.[٩٠٥٥]

کاتێك عەلی کوڕی ئەبووطالیب ویستی جەنگی شام بکات، چوو بۆ لای ئیبن عومەر و هانی دا تا لەگەڵیدا بەشداری بکات، ئیبن عومەر وتی منیش وەك ئەو خەڵکەی ترم، بەڵام بۆ جەنگ ئەمساڵ ئامادە نیم بەشداری بکەم، دواتر ئیبن عومەر خۆی ئامادە کرد و چوو بەرەو مەککە.[٩٠٥٦]

جا پێش ئەوەی بچێت بۆ مەککە، عەلی کوڕی ئەبووطالیب بوو بە کەفیلی ئیبن عومەر کە دژی ناوەستێت، دواتر ئیبن عومەر چوو بۆ لای ئومموکلثومی کچی عەلی کە ژنی عومەری کوڕی خەططاب بوو و پێی وت کە دەچێت بۆ عومرە، هەروەها وتی من تەواو گوێڕایەڵی عەلیم جگە لە فەرمان کردنی بە جەنگ و راپەڕین، دواتر وا هەواڵ برا بۆ عەلی وتیان ئەمشەو بارێکی سەختتر لەوەی عائیشەو طەلحەو زوبەیرو موعاویە روویداوە، وتی چی بووە؟ وتیان ئیبن عومەر چووە بۆ شام، وەزعەکە شڵەقا، کە ئومموکلثوم ئەوەی بیست، هات بۆ لای عەلی و بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد، عەلیش دەروونی ئارام بوویەوەو وتی برۆن بەخوا نە من بەدرۆ کەوتمەوەو نە ئەو درۆی رد، بەخوا من متمانەم زۆرە پێی.[٩٠٥٧]

کاتێك موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان ویستی بەیعەت بۆ یەزیدی کوڕی وەربگرێت تا دوای خۆی شوێنی بگرێتەوە، عەبدوڵای کوڕی عومەر بەیعەتی نەدا، هەریەك لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبووبەکر و

---

٩٠٥٤ - صحيح البخاري، الرقم ٣٥١٦، سنن الترمذي، الرقم ٣٧٢٦، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٩٢.

٩٠٥٥ - أسد الغابة، ج٣، ص ٣٤٩.

٩٠٥٦ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣١.

٩٠٥٧ - الكامل في التأريخ لابن أثير، ج٣، ص ١٠٠.

عەبدوڵای کوڕی عومەر و حوسەینی کوڕی عەلی و عەبدوڵای کوڕی عەبباسیش بەیعەتیان نەدا، ئەوەبوو موعاویە خۆی هات بۆ حیجاز بۆ عومرەو، کاتێك لە مەککەوە گەڕایەوەو دای بە مەدینەدا، هەریەك لەوانەی دواند، ئیبن عومەر لە هەموویان زمانی نەرمتر بوو، هەرچۆن بێت بە موژدەو ترساندنیش ڕەزامەندی ئەوانی وەرگرت بۆ بەیعەتدان بە یەزیدی کوڕی.[٩٠٥٨]

موعاویە پلەوپایەی ئیبن عومەری لەبەرچاو بوو، بۆیە دەبینین لە وتارێکیدا دەیوت ئەی خەڵکینە من باشترینتان نیم، بەڵکو لە من باشتر لەنێوتاندا هەیە، عەبدوڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵای کوڕی عەمر و چەندێکی تر جگە لەو دوانەش.[٩٠٥٩]

ئیبن عومەر هاودەم بە هاوەڵانێکی تری وەك ئیبن عەبباس و ئیبن زوبەیر و ئەبوو ئەییووبی ئەنصاری بەشداری هێرشی سەر قوستەنتینیەی کرد.[٩٠٦٠]

کە موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان وەفاتی کرد، یەزیدی کوڕی نامەی نووسی بۆ وەلیدی کوڕی عوتبە کە والی مەدینە بوو و هەواڵی مەرگی موعاویەی پێدا و داوای لێکرد هەرچۆنێك بێت بەیعەتی بۆ وەربگرێت لە هەریەك لە حوسەین و ئیبن عومەر و ئیبن زوبەیر.[٩٠٦١]

کاتێك موعاویە مرد، ئیبن عومەر لە مەککە بوو، لە ڕێدا حوسەینی کوڕی عەلی و ئیبن زوبەیری بینی، وتی دەنگوباس چیە؟ وتیان موعاویە مرد و بەیعەت بە یەزید دەدرێت، ئیبن عومەر وتی لەخوا بترسن و یەکڕیزی موسڵمانان پەرت مەکەن.[٩٠٦٢]

کاتێك یەزید هاتە سەر دەسەڵات سەرەتا ئیبن عومەر بەیعەتی پێ نەدا، وەلید ناردی بە دوایدا و داوای لێکرد بەیعەت بدات بە یەزید، ئیبن عومەر وتی ئەگەر هەموو خەڵکی بەیعەتیان دا ئەوکات منیش بەیعەت دەدەم، کابرایەك پێی وت دەتەوێت خەڵکی بکەونە ناکۆکی و یەکدی بکوژن و لەناوبچن و کەس

---

٩٠٥٨ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٧٩.

٩٠٥٩ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٣٤.

٩٠٦٠ - الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٣، ص ٣١٤.

٩٠٦١ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٤٦.

٩٠٦٢ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٤٨.

نەمێنێت تۆ نەبیت ئەوکات بەیعەت بدەیت؟! ئیبن عومەر وتی حەزم بەو قسانەت نیە، بەڵام ئەگەر خەڵکی هەموویان بەیعەتیان دا و تەنها من مامەوە ئەوە بەیعەت دەدەم.[٩٠٦٣]

کاتێك یەزید هاتە سەر دەسەڵات ئیبن عومەر بەیعەتی پێدا، دواتر منداڵەکانی کۆکردەوەو وتی ئێوە دەزانن ئێمە لەسەر بەیعەتی خوا و پێغەمبەرەکەی بەیعەتمان دا بەم پیاوە، جا من بیستوومە لە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (ناپاك لە ڕۆژی دواییدا ئاڵایەکی بۆ هەڵدەکرێت و دەوترێت ئەوە ناپاکی فلانە)، جا زۆر ناپاکیە کەسێك لەسەر بەیعەتی خواو پێغەمبەرەکەی بەیعەت بدات بە کەسێك و دواتر بیشکێنێت.[٩٠٦٤]

لە کاتی شۆڕشەکەی حوسەینی کوڕی عەلیدا ئیبن عومەر هەڵوێستێکی ڕوونی هەبوو، ئەوەبوو ئیبن عومەر هاتە مەدینەو هەواڵی حوسەینی پرسی، پێی وترا بەرەو عێراق کەوتووەتەڕێ، ئەوەبوو ئیبن عومەر خێرا چوو بە دوایدا و پاش دوو ڕۆژە ڕێ ئینجا گەیشت بە حوسەین، پێی وت بۆ کوێ دەچیت؟ وتی بۆ عێراق، ئیبن عومەر وتی مەڕۆ بۆ لایان، حوسەین وتی ئەوە نامەکانیانن و بەیعەتیان بۆ ناردوم، ئیبن عومەر وتی خوای گەورە پێغەمبەری خۆی سەرپشك کرد لەنێوان دنیا و ئاخیرەتدا، ئەویش ئاخیرەتی هەڵبژارد، ئێوەش بەشێکن لە پێغەمبەر (ﷺ)، هەرگیز هیچکامتان دنیاتان بۆ نابێت، خوای گەورەش کە دنیای لێ دورو گرتون چاکتری بۆ داناون، ئینجا خەڵکی عێراق خەڵکێکی خراپن و باوکتیان کوشت و دایان لە براکەشت و ئەوەو ئەوەیان کرد، بەڵام حوسەین قەناعەتی نەکرد و ڕازی نەبوو، دواجار ئیبن عومەر کە زانی حوسەین هەر دەڕوات دەستی کردە ملی وتی ماڵئاوایی کوژرانت لێدەکەم- وەك کوژراوێك ماڵئاواییت لێدەکەم-.[٩٠٦٥]

ئینجا عەبدوڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵای کوڕی عەبیاش کە لە عومرەوە دەهاتنەوە چوون بۆ لای حوسەین و عەبدوڵای کوڕی زوبەیر، ئیبن عومەر وتی بۆ خاتری خوا بگەڕێنەوە بۆ ئەو بارەی خەڵکی تێدان و بۆ خەڵك باشترە و پەلە مەکەن، ئەگەر خەڵکی هەموو ڕازی بوون پێی ئەم دوانەش خۆتان جیا مەکەنەوە، ئەگەریش خەڵکی هەموان لەسەری ڕازی نەبوون ئەوکات ئەوەی دەتانەوێت بیکەن.[٩٠٦٦]

---

٩٠٦٣ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٤٨.

٩٠٦٤ - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٥٤٦٤، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٤٩١٩، البداية و النهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٣٢.

٩٠٦٥ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٢-٢٩٣.

٩٠٦٦ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٦.

ئیبن عومەر زۆر دڵگران بوو بە کوژرانی حوسەین و ئەوەی بە پەڵەی رەشی نێو چاوانی عێراقیەکان دەزانی، بۆیە کاتێك عێراقیەك پرسیاری کرد ئەگەر کەسێك ئیحرامی بەستبوو و مێشێکی کوشت حوکمەکەی چیە؟ ئیبن عومەر وتی خەڵکی عێراق سەبارەت بە کوشتنی مێش پرسیار دەکەن، لەکاتێکدا کچەزای پێغەمبەری خوایان (ﷺ) کوشت کە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو ئەو دوانە رەیحانەکانی دنیای منن.[9067]

یەزید پلەوپایەی ئیبن عومەری لەبەرچاو بوو و رێزی بڕیارو پێشنیازەکانی دەگرت، ئەوەبوو کاتێك موختاری ثەقەفی بەند کرا، ئیبن عومەر نامەیەکی نارد بۆ یەزید و داوای لێکرد ئازادی بکات، یەزیدیش نامەی نارد بۆ ئیبن زیاد و فەرمانی کرد هەرکە ئەم نامەت پێگەیشت موختار ئازاد بکە، ئەویش ئازادی کرد.[9068]

لە سەردەمی ئیبن زوبەیردا کاتێك عەبدوڵا لە مەککەوە خیلافەتی راگەیاند و موسڵمانان کەوتنە بەیعەتدان پێی، چەند کەسێك لەو نێوەندەدا بەیعەتیان پێ نەدا، ئەوانەی بەیعەتیان پێ نەدا بریتی بوون لە عەبدوڵای کوڕی عومەرو عەبدوڵای کوڕی عەبباس و ئیبنولحەنەفیە.[9069]

ئیبن عومەر زۆر تکای لە ئیبن زوبەیر دەکرد تا واز بهێنێت لەو کارەی و نەبێتە هۆکاری نانەوەی جەنگ لە حەرەمدا.[9070]

هاوکات پلەوپایەی ئیبن زوبەیری دەزانی و کاتێك بینی حەججاج خەریکە درۆی بۆ هەڵدەبەستێت بەرگریەکی مەردانەی کرد لە ئیبن زوبەیر.[9071]

ئیبن عومەر بە نامەیەك بەیعەتی خۆی بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان نیشاندا، ئەویش لەو روانگەوە کە لە نامەکەیدا نووسیبووی(لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە بۆ عەبدولمەلیکی ئەمیری باوەڕداران...تۆ بەرپرسیت و هەر بەرپرسێکیش بەرپرسیارە لە ژێردەستەکانی).[9072]

---

٩٠٦٧ - صحيح البخاري، الرقم ٣٥٦٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٠٧٩ و اللفظ له، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٣٩٣، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٨١٥.

٩٠٦٨ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٤٩.

٩٠٦٩ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٣٩.

٩٠٧٠ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٤٠.

٩٠٧١ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٣٢.

٩٠٧٢ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٩، ص ٦٣.

کاتێك عەبدوڵای کوڕی زوبەیر کوژرا، تەرمەکەی لەخاچ درا تا خەڵك بیبینێت، کە عەبدوڵای کوڕی عومەر دای بە لای تەرمەکەیدا، وەستا و وتی سەلامت لێ بێت ئەبووخوبەیب، سێ جار ئەوەی وتەوە، ئینجا وتی بەخوا من زۆر رێگریم لێکردیت لەمە، سێ جار ئەوەشی وتەوە، بەخوا هێندەی من تۆم ناسیبێت کەسێك بوویت نوێژ و رۆژووت زۆرزۆر بوو و پەیوەندی خزمایەتیشت زۆر بەهێز راگرتبوو، بەخوا ئوممەتێك تۆ خراپترینی بیت چاکترین ئوممەتە، پاشان عەبدوڵای کوڕی عومەر چوو، ئینجا حەججاج ئەو هەڵوێستەی ئیبن عومەری بیست، ناردی تەرمەکەی عەبدوڵا داگیرایە خوارەوەو فڕێ درایە ناو گۆڕستانی جوولەکەکان.[٩٠٧٣]

جارێك ئیبن عومەر لە دەوروبەری مەدینە لەگەڵ هاوەڵانێکیدا بوو نانیان دەخوارد، کابرایەکی شوانیش دای بەلایاندا و سەلامی کرد، ئیبن عومەر وتی وەرە نانێکمان لەگەڵ بخۆ، شوانەکە وتی من بەڕۆژووم، ئیبن عومەر وتی لە رۆژێکی ئاوا گەرمدا بەرۆژوو دەبیت و شوانەییش دەکەیت؟ کابرا وتی من دەرفەت لەم رۆژانەم وەردەگرم، ئیبن عومەر ویستی دنیانەویستی کابرا تاقی بکاتەوە، وتی یەکێك لەو مەڕانەمان پێدەفرۆشیت و دواتریش شتێك لە گۆشتەکەی بەشت دەدەین تا ئێوارە رۆژووی پێ بکەیتەوە؟ شوانەکە وتی ئەوانە مەڕی من نین، ئیبن عومەر وتی جا گەورەکەت بە نەمانی مەڕێك هیچ ناکات، شوانەکەش پشتی هەڵکرد و پەنجەی رووەو ئاسمان بوو و دەیوت ئەی خوا لە کوێیە؟ ئیبن عومەریش بەو شوانە سەرسام بوو و بەردەوام قسەکەی شەوانەکەی دووبارە دەکردەوە ئەی خوا لە کوێیە؟ کە هاتەوە مەدینە، کەسێکی نارد بۆ لای مەولای ئەو شوانەیەو شوانەکەو مەڕەکانیشی لێ کڕی و شوانەکەی ئازاد کرد و مەڕەکانیشی پێبەخشی.[٩٠٧٤]

ئیبن عومەر لە ساڵی حەفتا و سێی کۆچی و پاش سێ مانگ لە کوژرانی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر وەفاتی کرد، رایەکیش هاتووە کە لە ساڵی حەفتا و چواری کۆچیدا وەفاتی کردووە، لە کاتی وەفاتیدا تەمەنی نزیکەی هەشتاو سێ یان هەشتاو چوار ساڵان بوو، هۆکاری مردنەکەشی وا هاتووە کە حەججاج رقی لێهەگرتووەو فەرمانی کردووە کەسێك سەرەرمێکی ژەهراوی لەبەر پێی ئیبن عومەردا داناوە، بەو

---

٩٠٧٣ - صحيح مسلم، الرقم ٤٧٢٢، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٣٦٤٩.

٩٠٧٤ - أسد الغابة، ج٣، ص ٣٤٨.

هۆیەوە ئیبن عومەر ماوەیەك نەخۆش كەوتووەو دواتر وەفاتی كردووە، دواتر حەججاج نوێژی لەسەر تەرمەكەی كرد و ئەسپەردە كرا.[٩٠٧٥]

ئیبن عومەر فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوەو كتێبەكانی فەرموودە پڕن لە گێڕانەوەكانی ئیبن عومەر.

ئیبن عومەر یەكێك بوو لەوانەی كە ئەوەی لای خۆشەویست بوایە لەبەر خوا دەیبەخشی، بەخشندەییشی ناسراو بوو، جا كۆیلەكانی بەردەستی ئەوەیان دەزانی، بۆیە زۆرجار كارێكیان دەكرد كە ئازادیان بكات، خەڵكی دەیانوت ئەوانە تۆ هەڵدەخەڵەتێنن، ئیبن عومەریش دەیوت هەركەس بۆ خوا هەڵمانبخەڵەتێنێت بۆی هەڵدەخەڵەتێین، ئینجا جار هەبوو كۆیلەكە دوای ئازادبوونیشی داوای یارمەتیشی لێدەكرد، جارێك كە كۆیلەیەكی ئازاد كرد، كۆیلەكە وتی وا ئازادت كردم، دەی بڕێك پارەشم بدەرێ تا پێی بژیم، ئیبن عومەر چل هەزاری پێدا.[٩٠٧٦]

---

٩٠٧٦ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٩، ص ٤-٥.

٩٠٧٧ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٢٠٠.

٩٠٧٨ - المطالب العالية لابن حجر، الرقم ٤١٢٤، مسند عبد بن حمدي، الرقم ٦٧٤، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٣٩٧٨.

## عەبدوڵای کوڕی زوبەیری کوڕی عەووام(ﷺ)

ناوی عەبدوڵای کوڕی زوبەیری کوڕی عەووامی کوڕی خوەیلیدی قورەیشی ئەسەدیە، یەکێکە لە هاوەڵە گەنجەکانی دەوری پێغەمبەر (ﷺ)، کونیەکەی ئەبووبەکر و ئەبووخوبەیبیشە.[٨٦٣٤]

زوبەیری باوکی یەکێك بوو لە هاوەڵە ناسراوەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و یەکێك بوو لە دە موژدەپێدراوەکانی بەهەشت، پێشتر لە پیتی(ز) دا بە وردی ژیانەکەیمان باس کردووە.

دایکی ناوی ئەسمائی کچی ئەبووبەکر بوو، ئەسمائی کچی ئەبووبەکری صدیق کە یەکێکە لە ئافرەتە زۆر خواناسەکان و خوشکە گەورەی عائیشەی دایکی باوەڕدارانە، واتە زوبەیر ئاوزاوای پێغەمبەر (ﷺ) بوو، لەگەڵ ئەم ژنەی کۆچی کرد بۆ مەدینەو لەوێ چەند منداڵێکی بوو، عەبدوڵا، عوروە، مونذیر،[٨٦٣٥] عاصم، موهاجیر، خەدیجەی گەورە، ئوممولحەسەن، عائیشە.[٨٦٣٦]

---

٨٦٣١ - صحيح البخاري، الرقم ٩٧٩، صحيح مسلم، الرقم ١٥٣٤، صحيح ابن خزيمة، الرقم ١٣٢١، صحيح ابن حبان، الرقم ٢٩١٧، سنن أبي داود، الرقم ٩٩٨.

٨٦٣٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٩٨.

٨٦٣٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٨٩.

٨٦٣٤ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص ٩٠٥.

٨٦٣٥ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٢.

٨٦٣٦ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٠٠.

## لەدایکبوونی عەبدوڵا:

عەبدوڵای کوڕی زوبەیر لە یەکەم ساڵی کۆچیدا لەدایك بوو و یەکەم منداڵی لەدایکبووی کۆچەران بوو پاش کۆچ بۆ مەدینە.[٨٦٣٧]

ئەسمائی دایکی باسی سکپڕی خۆی بە عەبدوڵا و لەدایکبوونی عەبدوڵاوە دەکات و دەڵێت سکم هەبوو، کە گەیشتمە مەدینەو لە قوبائدا دابەزیم، لەوێ منداڵەکەم بوو، دواتر منداڵەکەم بردە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و خستمە کۆشی، ئەویش داوای خورمایەکی کرد و خورماکەی مژی و دواتر خستیە دەمی منداڵەکەوە، یەکەم شت چوویە ناو سکی منداڵەکەمەوە، لیکی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، دواتر خورماکەی هێنا بە دەم و لێوی منداڵەکەدا،[٨٦٣٨] جا موسڵمانان بە بیستنی هەواڵی لەدایکبوونی عەبدوڵا تەکبیریان دەکرد، چونکە جوولەکەکان دەیانوت جادوویان کردووە لە موسڵمانان منداڵی کوڕیان نەبێت، کەچی بەوە خوای گەورە جوولەکەکانی بەدرۆ خستەوە.[٨٦٣٩]

عەبدوڵا تەمەنی نزیکەی حەوت یان هەشت ساڵان دەبوو کە زوبەیری باوکی بردی بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) تا بەیعەت بدات، پێغەمبەر (ﷺ) کە بینی وا عەبدوڵا دێت، بزەیەکی کرد و بەیعەتی لێوەرگرت.[٨٦٤٠]

دواتر زوبەیر ئەسمائی تەڵاق داو ئەسمائیش لای عەبدوڵای کوڕی مایەوە.

عەبدوڵای کوڕی زوبەیر دەڵێت لە غەزای خەندەقدا من و عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە لەو شوێنە بووین کە ژنەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەوێ بوون، جا یەکترمان بەرز دەکردەوە تا لە سەروو دیوارەکەوە تەماشای جەنگەکە بکەین، جا کاتێك عومەر منی بەرز کردەوە دەمبینی باوکم هەڵمەتی دەبرد بۆ بەنی قورەیضەو لەگەڵیاندا جەنگی دەکرد،[٨٦٤١] عەبدوڵا کە ئەمەی گێڕایەوە بۆ باوکی، زوبەیر وتی ڕۆڵە گیان ئەوکات منت بینی؟ وتی بەڵێ، زوبەیر وتی ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی کێ دەچێت هەواڵی بەنی

---

٨٦٣٧ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٩٠.

٨٦٣٨ - صحيح البخاري، الرقم ٣٧١٧، صحيح مسلم، الرقم ٤٠٩٣، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٦٣٣٦.

٨٦٣٩ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٢٣٠.

٨٦٤٠ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٠١٩٨.

٨٦٤١ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٥٠.

قورەیضەم بۆ بهێنێت، منیش چووم، کە هاتمەوە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووم بەدایك و باوکمەوە بەقوربانت بم.[٨٦٤٢]

## عەبدوڵا لە سەردەمی راشیدیندا

عەبدوڵا لە سەردەمی خیلافەتی ئەبوبەکری صدیقدا هێشتا تەمەنێکی کەمی هەبوو، لەو ماوەو دواتریشدا نازی بێشوماری عائیشەی پووری هەبوو، هاوکات سوودێکی زۆری وەردەگرت لە زانستی دایکی باوەڕداران عائیشە، عورووەی برای عەبدوڵا دەڵێت خۆشەویستترین کەس لای عائیشە لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبووبەکرەوە عەبدوڵای کوڕی زوبەیر بوو.[٨٦٤٣]

عەبدوڵا لە سەرەتای تەمەنی پێگەیشتنیدا بوو کە هاودەم بە باوکی بەشداری جەنگی یەرمووکی کرد، لەو جەنگەدا هاودەم بە زوبەیری باوکی چوو بەشداری کرد، بەڵام بەشداری جەنگەکە نەبوو، بەڵکو زوبەیر تەنها بۆ راهێنان ئەوی برد و دوو کەسی راسپاردبوو تا ئاگاداری بن.[٨٦٤٤]

جارێك عومەری کوڕی خەططاب چوو بە کۆڵانێکدا کە برێك منداڵ یارییان دەکرد و عەبدوڵاش لەنێویاندا بوو، منداڵەکان هەموو رایانکرد تەنها عەبدوڵا نەبێت، عومەری کوڕی خەططاب وتی بۆچی تۆیش راتنەکرد؟ عەبدوڵا وتی تاوانم نەکردووە تا لێت بترسم، رێگەکەش تەنگ نیە تا رێت بۆ فراوان بکەم.[٨٦٤٥]

## عەبدوڵا لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا

عەبدوڵا لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا بەشداری جەنگ و فتووحاتی کرد، بەشداری ئەو هێرشە بوو کە برا بۆ فەتحی قوسطە نطینیە.[٨٦٤٦]

عەبدوڵا دەڵێت جارێك پرسیارم کرد لە باوکم وتی بۆچی دەتبینم وەك فلان و فلان نیت هێندە فەرموودە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بگێڕیتەوە؟! ئەویش وتی من هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەری خوا

---

٨٦٤٢ - صحيح البخاري، الرقم ٣٥٣٦، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٤١.

٨٦٤٣ - صحيح البخاري، الرقم ٣٣٣٤.

٨٦٤٤ - صحيح البخاري، الرقم ٣٧٧٦.

٨٦٤٥ - الكامل في التأريخ، ج٤، ص ١٢٨.

٨٦٤٦ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٣٣.

(ﷺ) بووم، بەڵام لێم بیستووە دەیفەرموو (من كذب علي فليتبوأ مقعده من النار)،[8647] (هەرکەس درۆم بەدەمەوە بکات با شوێنی خۆی لە دۆزەخ دیاری بکات).

عەبدوڵا لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا یەکێك بوو لەوانەی نوسخەکانی قورئانیان نووسیەوە.[8648]

هەروەها عەبدوڵای کوڕی زوبەیر یەکێك بوو لە بەشداربوانی فتووحاتی ئەفریقیا، لەو سوپایەدا کە عەبدوڵای کوڕی ئەبی سەرح سەرکردایەتی دەکرد، هەریەك لە عەبدوڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵای کوڕی زوبەیر بەشدار بوون، سوپای جەرجیری پاشای بەربەرەکانیش بە زیاد لە سەد هەزار جەنگاوەرەوە هات، سوپای موسڵمانانیش نزیکەی بیست هەزار جەنگاوەر بوو، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر جەرجیری بینی لە دوای سوپاکەوە بوو و دوو کەنیزەك باوەشێنیان دەکرد، بۆیە داوای لە ئەمیری سوپا کرد بڕێك کەسی لەگەڵ بنێرێت تا بچێت جەرجیر لەناوبەرێت، ئەویش بڕێك کەسی لەگەڵ نارد، عەبدوڵا چوو و سوپای دوژمنیش وایانزانی نامەی پێیەو دەیبات بۆ پاشاکەیان، چونکە بڕوایان نەدەکرد وا بچێت بەدەم مەرگەوە، عەبدوڵا کە گەیشتە لای جەرجیر، خێرا جەرجیر هەستی بە مەترسی کرد و رایکرد، بەڵام عەبدوڵا بە رمەکەی لێیدا و بە شمشێرەکەی سەری جەرجیری لێکردەوەو سەرەکەی بە رمەکەی بەرز کردەوەو تەکبیری کرد، بەوە بەربەرەکان پەرتەوازە بوون و رایاندەکرد و موسڵمانانیش کەوتنە کوشتن و گرتنیان.[8649]

لەو کاتەی عوثمانی کوڕی عەففان گەمارۆ درا، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر هاودەم بە ئیبن عومەر و حەسەن و حوسەین و مەڕوان و ئەبووهورەیرە و ژمارەیەکی تر وەستان تا بەرگری لە خەلیفە بکەن، خەلیفەش سوێندی دان کە وازبهێنن و بچنەوە ماڵەوە،[8650] بەڵام عەبدوڵا و حەسەنی کوڕی عەلی و مەڕوانی کوڕی حەکەم نەچوونەوەو بەرگرییان کرد، عەبدوڵا چەندین شمشێر و تیری بەرکەوت و زۆر بریندار بوو، هەروەها حەسەنی کوڕی عەلی و مەڕوانیش بریندار بوون.[8651]

---

٨٦٤٧ - صحيح البخاري، الرقم ١٠٦،

٨٦٤٨ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢١٧.

٨٦٤٩ -البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٥٢.

٨٦٥٠ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٨١.

٨٦٥١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٨٨.

کاتێك هەواڵی شەهیدبوونی عوثمان گەیشت بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب، عەلی تەواو شڵەژا و هاودەم بە طەلحەو زوبەیر و سەعد چوون بۆ لای عوثمان و بینییان کوژراوە، عەلی تووڕە بوو لە حەسەن و حوسەین و وتی ئێوە لەبەر دەرگا بوون و هێشتتان ئەمیری باوەڕداران بکوژرێت؟! ئەوانیش وتیان ئێمە ئاگادار نەبوین بە کوژرانی، عەلی دەستی بەرزکردەوەو بۆگزێکی دا لە حەسەن و دای بەسەر سنگی حوسەینیشدا، قسەشی وت بە موحەممەدی کوڕی طەلحەو عەبدوڵای کوڕی زوبەیر.[٨٦٥٢]

## عەبدوڵا لە کاتی کوژرانی باوکیدا

عەبدوڵا هاودەم بە زوبەیری باوکی بەشداری جەنگی جەمەلی کرد.

عەبدوڵا دەڵێت لە سەرەتاوە باوکم منی بانگ کرد و منیش لە کەناریەوە وەستام، باوکم وتی: کوڕی شیرینم ئەمڕۆ هەرکەس دەکوژرێت یان ستەمکارە یان ستەم لێکراوە، من وادەبینم ئەمڕۆ بە ستەملێکراوی دەکوژرێم، گەورەترین خەمیشم قەرزەکانمە، پێت وایە قەرزەکەت هیچ لە ماڵ و سامانمان بهێڵێتەوە؟ پاشان وتی کوڕە شیرینەکەم، ئەوەی هەمانە بیفرۆشەو قەرزەکەم بدەرەوە، ئینجا وەسیەتی کرد بۆ هەرچیەکی تر کە بمێنێتەوە.[٨٦٥٣]

عەلی بە زوبەیری وت سوێندت دەدەم بە خوا تۆ گوێت لە پێغەمبەر (ﷺ) نەبوو کە پێی دەفەرموویت تۆ لەگەڵ عەلی دەجەنگێیت و تۆیش ستەمی لێدەکەیت؟ ئەویش وتی بەڵێ، بەڵام ئەوە ئێستا ئەو فەرموودەیەم بیردەکەوێتەوە، بۆیە کەناری گرت.[٨٦٥٤]

ئینجا بە سوارەکەیەوە بە ناو ریزەکاندا دەگەڕایەوە، عەبدوڵای کوڕی وتی باوکە چیتە؟ زوبەیر وتی عەلی فەرموودەیەکی بۆ باسکردم کە من خۆم لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستبوو پێی فەرمووم (تۆ لەگەڵ عەلی دەجەنگیت و ستەمیشی لێ دەکەیت)، بۆیە لەگەڵی ناجەنگم، عەبدوڵا وتی بۆچی بۆ جەنگ هاتبوویت؟ تۆ هاتبوویت تا نێوانی خەڵکەکە ڕێکبخەیت و خوا بە هۆی تۆوە ئەم بارە ڕێکبخات، زوبەیر وتی سوێندم خواردووە جەنگ نەکەم، عەبدوڵا وتی دەی جیرجیسی کۆیلەت ئازاد بکەو بوەستە تا

---

٨٦٥٢ - الثقات لابن حبان، ج٢، ص ٢٦٥.

٨٦٥٣ - صحيح البخاري، الرقم ٢٩٧٨.

٨٦٥٤ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٥٥٣.

نێوانی خەڵك ڕێكبخەت، ئەویش كۆیلەكەی ئازاد كرد و ڕاوەستا، بەڵام خەڵكەكە جیاوازی زیاتری تێكەوت، بۆیە بە ئەسپەكەیەوە چوو.[8655]

زوبەیر كە چوو دای بە لای سەربازگەكەی ئەحنەفدا، ئەویش وتی كێ دەچێت هەواڵێكی ئەمەم بۆ وەربگرێت، ئیبن جرمووز وتی من، ئەوەبوو كەوتە شوێن زوبەیر، كە گەیشت بە زوبەیر، زوبەیر زۆر تووڕە بوو، وتی چیتە؟ ئیشت چیە؟ وتی هاتوم تا پرسیارێكت لێ بكەم، عەطیە كە خزمەتكارێكی زوبەیر بوو و لەگەڵ زوبەیر بوو وتی ئەو چەكی پێیە، بەڵام زوبەیر گوێی پێ نەدا، ئیبن جرمووز وتی كاتی نوێژە، ئەوەبوو دابەزین تا نوێژ بكەن، كەچی ئیبن جرمووز خۆی خستە پشتی زوبەیر و لە پشتەوە كەلەبەری زرێپۆشەكەی كردە ئامانج و دای لە زوبەیر و كوشتی و ئەسپ و چەكەكەشی برد، دواتریش وازی لە خزمەتكارەكەی هێنا، خزمەتكارەكەشی تەرمی زوبەیری ئەسپەردە كرد و دواتر چوو هەواڵەكەی بردەوە بۆ خەڵكەكە.[8656]

عەبدولا جڵەوی وشترەكەی عائیشەی پووری گرتبوو و ئاگاداری پووری بوو و هیچ قسەیەكیشی نەدەكرد، لەو كاتەدا ئەشتەری نەخەعی هەڵمەتی بۆ برد و یەكتریان بریندار كرد، عەبدولا لە جەنگی جەمەلدا هێندە بریندار بوو كە دەوترێت نزیكەی سی و حەوت برینی پێوە بووە.[8657]

## عەبدولا پاش شەهیدبوونی باوكی

كاتێك بارەكە هێور بوویەوە، ئینجا عەبدولا دەستی كرد بە دانەوەی قەرزەكانی باوكی، زوبەیر دەڵێت حسابم كرد قەرزەكانی نزیكەی ملیۆنێك و دووسەد هەزار دەبوو، گەیشتم بە حەكیمی كوڕی حیزام، وتی برازاكەم قەرزەكەی براكەم چەندە؟ منیش حەزم نەكرد بیڵێم چەندە، وتم دووسەد هەزار، وتی دەی بڕوا ناكەم ئەوەی هەتانە بەشی دانەوەی بكات، منیش وتم ئەی ئەگەر ملیۆنێ و دووسەد هەزار بێت چی؟ وتی وا نابینم بتوانن بیدەنەوە، ئەگەر پەكت كەوت پێم بڵێ یارمەتیت دەدەم، عەبدولا باخەكەی زوبەیری فرۆشت بە ملیۆنێك و شەش سەد هەزار، دەیوت كێ قەرزی لای زوبەیر بووە با بێت باخەكەمان لێ بكرێت، عەبدولای كوڕی جەعفەر هات كە چوارسەد هەزاری لای زوبەیر بوو، وتی حەز دەكەن مەمدەنەوە، حەزیش دەكەن دوای خەن، عەبدولا وتی نا، ئەویش وتی دەی پارچەیەكی

٨٦٥٥ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٥٥٢، حسنه الألباني بل صصحه للوجه الثاني للسند في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٢٦٥٩.

٨٦٥٦ - تاريخ الطبري، ج٣، ص ٥٥.

٨٦٥٧ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٤٤.

**باخەکەم بدەنێ، بەوجۆرە باخەکەی بەش بەش فرۆشت و هەموو قەرزەکەی دایەوەو زیاد لە چوارسەد هەزاریشی بۆ مایەوە.**[٨٦٥٨]

**عەبدوڵا یەکێك بوو لە ئامادەبوانی تەحکیم وەك چۆن ژمارەیەکی زۆری خەڵك ئامادەی بوون.**[٨٦٥٩]

**لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیاندا عەبدوڵا و حەسەنی کوڕی عەلی چوون بۆ لای موعاویە، موعاویە کە حەسەنی بینی، وتی مەرحەبا لە نەوەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئینجا فەرمانی کرد سێ سەد هەزاری پێ بدرێت، بە عەبدوڵاشی وت مەرحەبا لە پوورزای پێغەمبەر (ﷺ) و فەرمانی کرد سەد هەزاری پێ بدرێت.**[٨٦٦٠]

**کاتێك موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان ویستی بەیعەت بۆ یەزیدی کوڕی وەربگرێت تا دوای خۆی شوێنی بگرێتەوە، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر بەیعەتی نەدا، هەریەك لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبووبەکر و عەبدوڵای کوڕی عومەر و حوسەینی کوڕی عەلی و عەبدوڵای کوڕی عەبباسیش بەیعەتیان نەدا،**[٨٦٦١] **بەڵام موعاویە بە نابەدڵی بەیعەتی وەرگرت لێیان، دواتر کە موعاویە مرد حوسەین و عەبدوڵا بەیعەتیان نەدا بە یەزید.**[٨٦٦٢]

**کاتێك موعاویە مرد یەزید نامەی نارد بۆ وەلیدی کوڕی عوقبە کە والی مەدینە بوو، داوای لێکرد بەیعەتی بۆ وەربگرێت، وتی سەرەتا لە کەسە بەناوبانگەکانەوە دەست پێ بکەو لەگەڵ حوسەین نەرمونیان بە، وەلیدیش ناردی بە شوێن حوسەین و ئیبن زوبەیردا، هێشتا شەو بوو، داوای کرد لە هەردووکیان بەیعەت بدەن بە یەزید، ئەوانیش وتیان با بەیانی بێتەوە بزانین خەڵکی چی دەکەن، هەر ئەو شەوە لە مەدینە دەرچوون بەرەو مەککە، کە گەیشتنە ئەوێ حوسەین لەماڵی عەبباس دابەزی، عەبدوڵای کوڕی زوبەیریش لە ماڵی حجر دابەزی و بەیانی و ئێوارە سەردانی حوسەینی دەکرد و بەردەوام خەڵکی هاندەدا دژی ئومەویەکان، عەبدوڵا داوای لە حوسەین دەکرد بەرەو عێراق بچێت و**

---

٨٦٥٨ - المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ١١٠.

٨٦٥٩ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٨٢.

٨٦٦٠ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٣٧.

٨٦٦١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٧٩.

٨٦٦٢ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩١-٢٩٢.

دەیوت ئەوان هەواداری تۆن، بەڵام ئیبن عەبباس بەردەوام رێگری لێدەکرد و دەیوت کاری وا نەکەیت.[٨٦٦٣]

بەڵام لە گێڕانەوەی تردا هاتووە کاتێك حوسەینی کوڕی عەلی ویستی بچێت بۆ عێراق، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر حوسەینی دواند کە بۆچی دەچێت، حوسەین وتی بەیعەتی چل هەزار کەسم بۆ هاتووە کە تەڵاق و بەڵێنی مەرگیان داوە لەگەڵ منن، عەبدوڵاش ئاگاداری دەکردەوەو دەیوت دەچیت بۆ لای خەڵکێك کە باوکی تۆیان کوشت و براکەشیان دەرکردیت؟![٨٦٦٤]

عەبدوڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵای کوڕی عەییاش کە لە عومرەوە دەهاتنەوە چوون بۆ لای حوسەین و عەبدوڵای کوڕی زوبەیر، ئیبن عومەر وتی بۆ خاتری خوا بگەڕێنەوە بۆ ئەو بارەی خەڵکی تێدان و بۆ خەڵك باشترە و پەلە مەکەن، ئەگەر خەڵکی هەموو رازی بوون پێی ئەم دوانەش خۆتان جیا مەکەنەوە، ئەگەریش خەڵکی هەموان لەسەری رازی نەبوون ئەوکات ئەوەی دەتانەوێت بیکەن.[٨٦٦٥]

کاتێك حوسەین ویستی بچێت بۆ عێراق، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر چوو بۆ لای حوسەین و وتی پێم باشە نەچیت بۆ کووفەو لە حیجازەوە ئەو کارە دەست پێ بکەیت و ئێمەش دژایەتیت ناکەین و پشتیوانت دەبین و بەیعەتت پێ دەدەین، بەڵام حوسەین زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی جەنگ و ئاژاوەیەك رووبدات نەکەوێتە مەککەو مەدینەوە، بۆیە ئامادەیی نەبوو لە حیجازەوە دەست پێ بکات.[٨٦٦٦]

دوای حوسەینی کوڕی عەلی، لەملاوە عەبدوڵای کوڕی زوبەیر لە حیجازەوە راپەڕی، بۆیە یەزید موسلیمی کوڕی عوقبەی نارد بۆ حیجاز و گەمارۆی مەدینەی دا تا ئیبن زوبەیر لەناو ببات، ئەوەبوو رووداوی دڵتەزێنی الحرة روویدا، دواتر لەوێوە چوو بەرەو مەککە تا ئیبن زوبەیر لەناو بەرێت، بەڵام لە رێدا مرد، بۆیە یەزید حوصەینی کوڕی نومەیری لە شوێنیدا دانا و حوصەین چوو گەمارۆی مەککەی دا و زیانی زۆری بە مەککە گەیاندو تیایدا بەشێك لە کەعبە بە دەستی هێرشی ئومەویەکان سووتا،[٨٦٦٧] لەو

---

٨٦٦٣ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٥.

٨٦٦٤ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٦١.

٨٦٦٥ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٦.

٨٦٦٦ - الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤٠٠.

٨٦٦٧ - أسد الغابة، ج٣، ص ٢٤٧.

ماوەدا دەستەیەك لە خەواریجەكان پشتگیری عەبدوڵای كوڕی زوبەیریان دەكرد، بەڵام دواتر كە خیلافەتی ڕاگەیاند، پاشگەز بوونەوە، چونكە زانییان عەبدوڵا عوثمانی كوڕی عەففانی خۆشویستووەو لێی ڕازی بووە، بۆیە لەبری پشتیوان بوون بە دوژمنی.[٨٦٦٨]

بەڵام یەزید ئەو ئاواتەی هەیبوو بە لەناوبردنی دەسەڵاتی ئیبن زوبەیر نەهاتەدی تا مرد.[٨٦٦٩]

دوای مردنی یەزید ئەو سوپایەی چووبوو بۆ لەناوبردنی عەبدوڵا گەڕایەوە بۆ شام، بەوە قەڵەمڕەوی عەبدوڵا لە حیجاز زیادی كرد.[٨٦٧٠]

## دەسەڵاتی عەبدوڵای كوڕی زوبەیر

پاش مردنی یەزید و هاتنی موعاویەی كوڕی كە پیاوێكی زۆر خواناس بوو و كەم ژیاو وەفاتی كرد و كەسی لە دوای خۆی دیاری نەكرد، ئیتر بۆشاییەك لە دەسەڵاتدا دروست بوو، ئەمە دەرفەتێكی باش بوو بۆ عەبدوڵا تا بەیعەتی پێ بدرێت و ببێتە خەلیفە،[٨٦٧١] گرنگتر لە هەمووی موعاویەی كوڕی یەزید پێش مەرگی خۆی بەیعەتی بۆ هیچ كەس وەرنەگرت.[٨٦٧٢]

عەبدوڵا لە مەككەوە خیلافەتی ڕاگەیاند و موسڵمانان كەوتنە بەیعەتدان پێی، چەند كەسێك بەیعەتیان پێ نەدا، عەبدوڵا ئومەویەكانی لە حیجاز دەرپەڕاند و هەموانیان بەرەو شام ڕایانكرد.[٨٦٧٣]

ئەوانەی بەیعەتیان پێ نەدا بریتی بوون لە عەبدوڵای كوڕی عومەرو عەبدوڵای كوڕی عەبباس و ئیبنولحەنەفیە.[٨٦٧٤]

---

٨٦٦٨ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٣٩.

٨٦٦٩ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٢٣٤.

٨٦٧٠ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٣٨.

٨٦٧١ - خوێنەری ئازیز، لەبەرئەوەی نووسینەكە تایبەت نیە بە وردەكاریە مێژووییەكانەوەو ئەگەر بۆ هەر هاوەڵێك ئەو وردەكاریانە بهێنین لەوانەیە دەیان بەرگی بوێت تا نوسینەكە تەواو بێت، بۆیە پوختەیەكی پێویست سەبارەت بە ماوەی دەسەڵات تا كوژرانی عەبدوڵای كوڕی زوبەیر دەخەینەڕوو و خوێنەر دەتوانێت بۆ زانیاری زیاتر سوود لەو نووسینانە وەربگرێت كە تایبەت بە ماوەی دەسەڵاتی عەبدوڵای كوڕی زوبەیر نووسراون و بە زمانی كوردیش بەردەستن.

٨٦٧٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٣٨.

٨٦٧٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٩، ص ٦٣.

٨٦٧٤ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٣٩.

هەریەك لە ئیبن عەبباس و ئیبنولحەنەفیە بە ژن و منداڵ و كەسانیانەوە چوون بۆ مەككەو لەوێ مانەوە، ئیبن زوبەیر داوای كرد بەیعەت بدەن، ئەوانیش وتیان بەیعەتت پێ نادەین و خۆت سەرقاڵی كاری خۆت بە، هاوكات نە دژایەتی تۆ دەكەین و نە دژایەتی بەرامبەرت دەكەین، بەڵام ئیبن زوبەیر زۆری دەكرد لێیان تا بەیعەت بدەن، كار گەیشتە ئەوەی دەیوت بەخوا یان دەبێت بەیعەت بدەن، یان دەتانسووتێنم.[٨٦٧٥]

ئەو ناوچانەی بەیعەتیان دا بە عەبدوڵای كوڕی زوبەیر بریتی بوون لە حیجاز و یەمەن و عێراق و میصر و خوراسان و هەموو شام جگە لە دیمەشق، ئەمەش لە ساڵی شەست و چواری كۆچیدا بوو،[٨٦٧٦] بەڵكو والی حیمص و قنسرین و فەلەستینیش بەیعەتیان پێدا،[٨٦٧٧] ئیتر عەبدوڵا كەوتە دانانی والی بۆ ناوچەكان.[٨٦٧٨]

بەڵام لەولاوە ئومەویەكان لە دیمەشق پاش كۆبوونەوەیەك كۆدەنگ بوون لەسەر ئەوەی مەڕوانی كوڕی حەكەم بەیعەتی پێ بدرێت، ئەو كارەیان كرد و پاش ڕوودانی جەنگێك و كوشتنی كاربەدەستانی ئیبن زوبەیر توانییان شام بگرنەوە دەست،[٨٦٧٩] دواتریش میصریان گرت و هەرچەند ئیبن زوبەیر ویستی بە سەركردایەتی موصعەبی برای دەسەڵاتی مەڕوان لەناوبەرێت، بەڵام سەركەوتوو نەبوو.[٨٦٨٠]

مەروان دواتر هەوڵیدا عێراقیش بگرێتەوە دەست و بۆ ئەوەش سوپای نارد بەڵام سەركەوتوو نەبوو، مەڕوان كۆچی دوایی كرد و كوڕەكەی هات كە هەر لە ژیانی باوكیدا بەیعەتی پێدرابوو.[٨٦٨١]

لەو ماوەدا ئیبن زوبەیر جەنگی خەواریجەكانی لە عێراق كرد و سوپاكەی سەركەوت بەسەریاندا و سەركردەی خەواریجەكانیش كوژرا.[٨٦٨٢]

---

٨٦٧٥ - سير أعلام النبلاء، ٣، ص ٣٥٦.

٨٦٧٦ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٣، ٣٣٩.

٨٦٧٧ -البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٣٩.

٨٦٧٨ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٣٩.

٨٦٧٩ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٣٩-٢٤٥.

٨٦٨٠ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٥٦.

٨٦٨١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٦٠.

٨٦٨٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٦١.

ئیبن زوبەیر لە ماوەی دەسەڵاتیدا بڕیاری دا کەعبە بڕووخێنێت و سەرلەنوێ بنیادی بنێتەوە، راوێژی کرد بە خەڵکەکەو هەندێ وەك جابیری کوڕی عەبدوڵا هاوڕای بوون، هەندێکیش وەك ئیبن عەبباس نەیاری بوون، بەڵام دواجار ئەو کارەی دەستپێکرد.[٨٦٨٣]

زوبەیر فشاری لەسەر ئیبنولحەنەفیە دروست کرد و بەندی کرد و هەرەشەی کوشتنیشی لێکرد، بەڵام موختاری کوڕی عوبەیدوڵا کە لە کووفە بوو و نەیاریی دژ بە هەریەك لە ئومەویەکان و ئیبن زوبەیریش راگەیاندبوو، سوپایەکی نارد و ئیبنولحەنەفیەو هاوەڵانی ئازاد کرد، لەوێوە ئیبنولحەنەفیە رووەو شام چوو، کەچی عەبدولمەلیکیش پێی راگەیاند یان بەیعەتی پێبدات یان لە خاکی ژێر دەسەڵاتی بچێتە دەرەوە، ئەویش وتی بەو مەرجە بەیعەتت پێ دەدەم پەنای هاوەڵەکانم بدەیت، ئەویش رازی بوو، بەوە ئیبنولحەنەفیە خوێنی هاوەڵەکانی پاراست، دواتر ویستی بچێت بۆ مەککە بۆ عومرە، بەڵام عەبدوڵا رێی پێ نەدا، ئیبنولحەنەفیە روویکردە مەدینەو لەوێ مایەوە تا دوای کوژرانی ئیبن زوبەیر، دواتریش وەستا تا حەججاج چوو بۆ عێراق، ئەوکات چوو بۆ مەککەو عومرەکەی کرد.[٨٦٨٤]

موختار کە لە کووفە بوو، زانی هەم ئومەویەکان و هەم ئیبن زوبەیریش دژایەتی دەکەن، ویستی پاڵ بداتە لای ئیبن زوبەیر، بەڵام لەو هەوڵە دیبلۆماسیەیدا سەرکەوتوو نەبوو.[٨٦٨٥]

عەبدوڵای کوڕی زوبەیر لە ساڵی حەفتای کۆچیدا موصعەبی برای بە سوپایەکەوە نارد بۆ عێراق و لەوێ لەگەڵ موختار بەرنگار بوویەوەو دواجار توانی سوپاکەی موختار تووشی شکست بکات وخودی موختاریش بکوژێت.[٨٦٨٦]

دوای ئەوەی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر ژمارەیەك لە هاشمیەکانی بەند کردبوو و بە هەوڵی موختار ئازاد کران، لەنێویاندا عەبدوڵای کوڕی عەبباسیش هەبوو، پاش ماوەیەك عەبدوڵای کوڕی عەبباس کۆچی دوایی کرد و بەیعەتی هیچ کەسی لە گەردن نەبوو.[٨٦٨٧]

---

٨٦٨٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٥١.

٨٦٨٤ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٩، ص ٣٨.

٨٦٨٥ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨،ص ٢٧٦.

٨٦٨٦ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٨٧-٢٨٨.

٨٦٨٧ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٠٦.

له ساڵی حەفتاو یەکی کۆچیدا سەرکردەی بەهێزی خیلافەتەکەی ئیبن زوبەیر کە موصعەبی برای بوو بە دەستی ئومەویەکان کوژرا، بەوە عێراقیش کەوتە دەست ئومەویەکان.[٨٦٨٨]

له ساڵی حەفتاو دووی کۆچیدا عەبدولمەلیك حەجاجی کوڕی یووسفی نارد بۆ گەمارۆی مەککە تا دەسەڵاتەکەی ئیبن زوبەیر لەناوبەرێت، ئەمەش لەسەرداوای خودی حەجاج بوو،[٨٦٨٩] حەجاج ماوەی پێنج مانگ و نیو گەمارۆی مەککەی دا، بە مەنجەنیق کەوتە لێدانی مەککە و خەڵکێکی زۆری کوشت، ئاو و خۆراکیشی لێ قەدەغە کردبوون، هەندێ لە بەردەکان بەر کەعبەش کەوتن، خەڵکەکە داوایان لە عەبدوڵا کرد لەگەڵیان رێکبکەوێت، بەڵام ئەو وتی بەخوا ئەوانە ئەگەر لەناو کەعبەشدا بتانگرن سەرتان دەبڕن، بۆیە هەرگیز داوای رێککەوتنیان لێ ناکەم، خەڵکەکە بەردەوام دەچوون بۆ لای حەجاج و داوای پەنایان دەکرد و عەبدوڵایان جێدەهێشت تا ئەوەی حەمزەو خوبەیبی کوڕیشی جێیانهێشت، عەبدوڵا چوو بۆ لای دایکی و سکاڵای حاڵی خۆی کرد چۆن هەموو خەڵکەکە جێیانهێشت، دایکی هانیدا تا خۆڕاگر بێت چونکە ئەو نیازەکەی بۆ قیامەت بووە، عەبدوڵا بەو وتانەی دایکی دڵخۆش بوو و چوو بەرگریەکی گەورەی کرد، لەو کاتەشدا هێشتا هەر شەونوێژی دەکرد، دواجار خشتێك کەوتەخوار و بەر سەری کەوت و سەری خوێناوی کرد و خستیە زەوی، خێرا دەستەیەك هاتن و کوشتیان و تەرمەکەیان برد بۆ لای حەجاج، دوای کوژرانی عەبدوڵا شیوەن مەککەی داگرت، بەڵام زۆرو زمانی حەجاج بێدەنگی کردن.[٨٦٩٠]

کوژرانی عەبدوڵا لە نیوەی جومادیلئاخیرەی ساڵی حەفتاو سێی کۆچیدا بوو.[٨٦٩١]

کاتێك عەبدوڵای کوڕی زوبەیر کوژرا، تەرمەکەی لەخاچ درا تا خەڵك بیبینێت، کە عەبدوڵای کوڕی عومەر دای بە لای تەرمەکەیدا، وەستا و وتی سەلامت لێ بێت ئەبووخوبەیب، سێ جار ئەوەی وتەوە، ئینجا وتی بەخوا من زۆر رێگریم لێکردیت لەمە، سێ جار ئەوەشی وتەوە، بەخوا هێندەی من تۆم ناسیبێت کەسێك بوویت نوێژ و رۆژووت زۆرزۆر بوو و پەیوەندی خزمایەتیشت زۆر بەهێز راگرتبوو، بەخوا ئومەتێك تۆ خراپترینی بیت چاکترین ئوممەتە، پاشان عەبدوڵای کوڕی عومەر چوو، ئینجا

---

٨٦٨٨ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣١٤-٣١٦.

٨٦٨٩ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٢٥.

٨٦٩٠ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٣٠-٣٣١.

٨٦٩١ - أسد الغابة، ج٣، ص ٢٤٧.

حەجاج ئەو هەڵوێستەی ئیبن عومەری بیست، ناردی تەرمەکەی عەبدوڵا داگیرایە خوارەوەو فڕێ درایە ناو گۆڕستانی جوولەکەکان، دواتر حەجاج ناردی بە شوێن ئەسمائی کچی ئەبوبەکری دایکی عەبدوڵادا، ئەسماء ئامادە نەبوو بچێت بۆ لای، چەند جار نێردراوی نارد و ئەسمائیش نەچوو، حەجاج وتی دێیت یان کەسێك بنێرم بە پرچەکانت راکێشی ئێرەت بکات، ئەسمائیش هەر نەچوو و وتی بەخوا نایەم بۆ لات تا کەسێك نەنێریت کە بێت بە پرچەکانم راکێشم بکات، حەجاج خۆی چوو بۆ لای ئەسماء، وتی بینیت چیم کرد بە دوژمنی خوا–مەبەستی عەبدوڵای کوڕی بوو–؟ ئەسماء وتی بینیم دنیای ئەو و قیامەتی خۆتت شێواند...پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو (لەناو ثەقیفدا درۆزنێك و خوێنڕێژێك دەردەکەون) جا درۆزنەکەمان بینی، بۆ خوێنڕێژەکەش تەنها تۆ شك دەبەم، حەجاج کە ئەوەی بیست هەستا و ئیتر نەهاتەوە بۆ لای ئەسماء..[٨٦٩٢]

عەبدوڵای کوڕی زوبەیر هێندە پەرستشی دەکرد کە کتێبەکانی مێژوو دەیان گێڕانەوەیان لە بارەی پەرستشیەوە تۆمار کردووە کە چۆن لەناو هاوەڵان و موسڵمانانندا بە زۆری پەرستش ناوبانگی هەبووە، رۆژووگرتن و شەونوێژەکانی بە نموونەی زۆر دەگمەن باسکراون.[٨٦٩٣]

---

٨٦٩٢ - صحيح مسلم، الرقم ٤٧٢٢، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٣٦٤٩.

٨٦٩٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٣٤.

## عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص(ﷺ)

ناوی عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصی قورەیشی سەهمیە، سەرەتا ناوی عاص بوو، پێغەمبەر (ﷺ) ناوی گۆڕی و ناوی نا عەبدوڵا.[٨٨٥١]

جارێك پێغەمبەر (ﷺ) عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصی بینی، فەرمووی ئەرێ عەبدوڵا وا بیستوومە بە ڕۆژ بەرۆژوویت و بە شەویش شەونوێژ دەکەیت؟ عەبدوڵا وتی بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا

---

٨٨٥١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٩٣.

(ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (وامەکە، ڕۆژوو بگرەو ڕۆژووش بشکێنە و شەونوێژیش بکەو بشخەوە، جەستەت مافی هەیە بەسەرتەوە، چاوت مافی هەیە بەسەرتەوە، هاوسەرت مافی هەیە بەسەرتەوە، میوانت مافی هەیە بەسەرتەوە، هێندە بەسە لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بیت چونکە بەوە بۆ هەر چاکەیەك دە بەرامبەرت بۆ هەیە، ئەوە دەبێتە ڕۆژووی هەموو ساڵەکە)، منیش هەر وازم نەهێنا و داوام دەکرد مۆڵەتی زیاترم بدات، وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من توانا لەخۆمدا بەدی دەکەم، فەرمووی(دەی وەك ڕۆژوی پێغەمبەری خوا داوود ڕۆژوو بگرە و لەوە زیاتر مەکە) وتم ڕۆژووی پێغەمبەری خوا داوود چۆن بووە؟ فەرمووی نیوەی ساڵەکە بەڕۆژوو دەبوو–واتە ڕۆژناڕۆژێك–، عەبدوڵا دواتر کە تەمەنی کرد و پیر بوو و توانای جارانی نەما، وتی خۆزگە مۆڵەت و کارئاسانیەکەی پێغەمبەری خوام (ﷺ) قبووڵ بکردایە.[٨٨٥٢]

عەبدوڵا فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.

عەبدوڵای کوڕی عەمر دەڵێت وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە فەرموودە لە تۆ دەبیستین، جا مۆڵەتمان دەدەیت بیاننووسین؟ فەرمووی بەڵێ، عەبدوڵا یەکەم کەس بوو نامەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بۆ خەڵکی مەککە نووسیەوە،[٨٨٥٣] عەبدوڵا دەڵێت وتم ئەوەی لە کاتی خۆشی و لە تووڕەییشدا دەیفەرموویت بینووسمەوە؟ فەرمووی(نعم، إنه لا ینبغی لی أن أقول إلا حقا)، (بەڵێ، من تەنها وتنی حەقم بۆ شیاوە–تەنها حەق دەڵێت).[٨٨٥٤]

عەبدوڵا دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی(المسلم من سلم المسلمون من لسانه ویده، والمهاجر من هجر ما نهى الله عنه)،[٨٨٥٥] (موسڵمان ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە زمان و دەستی پارێزراو بن، کۆچەریش ئەو کەسەیە کە دوور دەگرێت لەوەی خوا دوورەپەرێزی لێکردووە).

عەبدوڵای کوڕی عەمر دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی(أربع من کن فیه کان منافقا خالصا، ومن کانت فیه خصلة منهن کانت فیه خصلة من النفاق حتى یدعه، إذا اؤتمن خان، وإذا حدث

---

٨٨٥٢ - صحيح البخاري، الرقم ١٨٩١، صحيح مسلم، الرقم ٢٠٤٧، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٦٩٨.

٨٨٥٣ - صحيح ابن حبان، الرقم ٤٣٨٥، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٤٨٨٦، ضعفه شعيب الأرناؤوط،

٨٨٥٤ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٢٦،

٨٨٥٥ - صحيح البخاري، الرقم ١٠، صحيح ابن حبان، الرقم ٢٣٠، سنن أبي داود، الرقم ٢١٣٥، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٤٢٧، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٩٢٩٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٦٣٢٢، المعجم الصغير للطبراني، الرقم ٤٦١.

كذب، وإذا عاهد غدر، وإذا خاصم فجر)،[٨٨٥٦] (چوار سیفەت هەن هەرکەس تیایدا بێت ئەوە دووڕوویەکی تەواوە، هەرکەسیش سیفەتێك لەوانەی تێدا بێت ئەوە سیفەتێکی دووڕوویی تێدایە تا وازی لێدەهێنێت، ئەگەر سپاردەی درایە لا ناپاکی دەکات، ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، ئەگەر بەڵێنی دا ناپاکی دەکات، ئەگەریش دادوەری کرد ناحەقی بڵێت).

عەبدوڵای کوڕی عەمر دەڵێت بیستم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو (إن الله لا يقبض العلم انتزاعا ينتزعه من العباد، ولكن يقبض العلم بقبض العلماء، حتى إذا لم يبق عالما اتخذ الناس رءوسا جهالا، فسئلوا فأفتوا بغير علم، فضلوا وأضلوا)،[٨٨٥٧] (خوای گەورە زانست لە دەست بەندەکانی هەڵناگرێت، بەڵکو وا زانست هەڵدەگرێت کە زانایان دەباتەوە، تا ئەوەی کە زانایان نەمان، خەڵکی بڕێ سەرکردەی نەزان دەگرنەبەر، پرسیاریان لێدەکەن و ئەوانیش بێ زانست فەتوا دەدەن، خۆیان گومڕا دەبن و خەڵکیش گومڕا دەکەن).

سەبارەت بە وەفاتی، رایەك دەڵێت لە شام و لەساڵی شەست و پێنجی کۆچی و لە تەمەنی حەفتاو دوو ساڵیدا وەفاتی کردووە، چەند رایەکیش هاتووە لە میصر یان مەککە یان طائیف کۆچی دوایی کردبێت، سەبارەت بە ساڵی وەفاتی هەریەك لە ساڵی شەست و هەشت یان شەست و نۆی کۆچی هاتووە.[٨٨٥٨]

٨٨٥٨ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٩٣.

٨٨٥٩ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٩٩.

## عەبدوڵای کوڕی مەسعوود(ﷺ)

ناوی عەبدوڵای کوڕی مەسعوودی کوڕی غافیلی هوزەلیە، کونیەکەی ئەبوو عەبدوڕەحمانە، یەکێکە لە هاوەڵە ناسراوەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و لە زاناکانی ناو هاوەڵان کە فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە،[٩١٢٥] دایکی ناوی ئوموعەبدی کچی عەبدوددە.[٩١٢٦]

عەبدوڵای کوڕی مەسعوود کەسێکی لاوازی باڵاکورت بوو، جلی سپی دەپۆشی و بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا.[٩١٢٧]

ئیبن مەسعوود یەکێکە لە دەستەی یەکەمی موسڵمان بوان،[٩١٢٨] موسڵمان بوونەکەی هاوکات بوو لەگەڵ موسڵمان بوونی سەعیدی کوڕی زەید و فاطیمەی خوشکی عومەری کوڕی خەططاب کە خێزانی سەعید بوو، واتە ئیبن مەسعوود ماوەیەکی زۆر پێش عومەری کوڕی خەططاب موسڵمان بوو.[٩١٢٩]

هۆکاری موسڵمان بوونەکەشی ئەوە بوو کە ئیبن مەسعوود خۆی دەیگێڕێتەوەو دەڵێت من مەڕو ماڵاتی عوقبەی کوڕی ئەبی موعیطم دەلەوەڕاند، پێغەمبەر (ﷺ) دای بە لامدا و منیش منداڵ بووم، فەرمووی ئەی مێرمنداڵ شیر هەیە؟ وتم بەڵێ، بەڵام من راسپاردەم و هی خۆم نیە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی مەڕێك هەیە بەران نەچووبێتە لای؟ وتم بەڵێ، چووم و هێنام، پێغەمبەر (ﷺ) دۆشی و شیر هات و شیرەکەی کردە قاپێك و لێی خواردەوەو بەشی ئەبووبەکریشی دا، دواتر بە گوانەکەی

---

٩١٢٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٢٣٣.

٩١٢٦ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٥٠.

٩١٢٧ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص ٤٦٢ – ٤٦٣.

٩١٢٨ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص ٤٦١.

٩١٢٩ - أسد الغابة، ج٣، ص ٣٩٤.

فەرموو بوەستە، ئەوەبوو لە شیردان وەستا، منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو قسەم فێر بکە، ئەویش دەستی هێنا بەسەرمدا و نزای بۆ کردم و فەرمووی(خوا رەحمت پێ بکات تۆ مێرد منداڵێکی فێرکراویت).[9130]

ئیبن مەسعوود یەکەم کەس بوو دوای پێغەمبەر (ﷺ) بە ئاشکرا لە مەککە قورئانی خوێند، رۆژێك هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) وتیان بەخوا قورەیش گوێیان لەم قورئانە نەبووە بە ئاشکرا بۆیان بخوێنرێت، جا کێ ئەوە دەکات؟ عەبدوڵای کوڕی مەسعوود وتی من، وتیان دەبێت کەسێك بێت هۆزەکەی بەرگری لێ بکەن، وتی وازم لێ بهێنن چونکە خوا دەمپارێزێت، ئەوەبوو عەبدوڵا چوو و لە نێو قورەیشیەکاندا دەستی کرد بە قورئان خوێندن، ئەوانیش رامابوون و دەیانوت ئیبن ئوم عەبد چی دەڵێت، خەڵکێك وتیان ئەوە دەخوێنێت کە موحەممەد هێناویەتی، بۆیە هەستان و کەوتنە لێدانی دەموچاوی و ئەویش هەر قورئانی دەخوێند، دواتر وازیان لێهێنا و دەموچاوی تەواو تێکشکابوو، هاوەڵانی چوون بۆ لای و وتیان لەمە دەترساین تووشت ببێت، ئەویش وتی بەخوا بتانەوێت بەیانیش هەمدی دێم و لێرە قورئانیان لەنێودا دەخوێنمەوە، ئەوانیش وتیان نا بەسە، ئەوەی رقیان لێی بوو چپاندت بە گوێیاندا.[9131]

ژمارەیەك لە هاوەڵە لاوازەکان کۆدەبوونەوەو لە مەجلیسی پێغەمبەر (ﷺ) دادەنیشتن، کاتێ بێباوەڕان دەیانبینی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئەوانەدا دانیشتووە کە برێ کۆیلە و کەسانی لاواز و بێدەسەلات بوون لەسەر ئەوان گاڵتەیان پێ دەکرد، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) گوێی نەدەدا بە گەمژەیی بێباوەڕان، بێباوەڕەکان دەیانوت ئەگەر ئەوەی موحەممەد هێناویەتی چاك و باش بوایە ئەوانە پێش ئێمە نەدەکەوتن بۆ وەرگرتنی، خوای گەورەش ئەم ئایەتانەی دابەزاند (ولا تطرد الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي يريدون وجهه ما عليك من حسابهم من شيء وما من حسابك عليهم من شيء فتطردهم فتكون من الظالمين وكذلك فتنا بعضهم ببعض ليقولوا أهؤلاء من الله عليهم من بيننا أليس الله بأعلم بالشاكرين وإذا جاءك الذين يؤمنون بآياتنا فقل سلام عليكم كتب ربكم على نفسه الرحمة أنه من عمل منكم سوءا بجهالة ثم تاب من بعده وأصلح فأنه غفور رحيم)،[9132] سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەڵێت

---

٩١٣٠ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٧٠، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٣٤٧١، صححه أحمد شاكر، حسنه شعيب الأرناؤوط.

٩١٣١ - أسد الغابة، ج٣، ص ٣٩٥.

٩١٣٢ - البدايةو النهاية لابن كثير، ج٣، ص١٠٤.

من و ئیبن مەسعوود و بیلال و کابرایەك لە هوذەیل و دوو کەسی تر کە ناویان نازانم لەو کۆڕەدا بووین.[9133]

ئیبن مەسعوود دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) ئێمەی نارد بۆ لای نەجاشی کە هەشتا پیاو دەبووین، من و جەعفەر و ئەبوومووساو عەبدوڵای کوڕی عورفوطە و عوثمانی کوڕی مەظعوون، قوڕەیشیش عەمری کوڕی عاص و عمارەی کوڕی وەلیدیان بە بڕێك دیاریەوە نارد و هاتن بۆ لای نەجاشی، کە چوونە ژوورەوە بۆ لای نەجاشی کڕنووشیان بۆ برد و چوون بۆ لای، یەکێکیان لە لای راستیەوەو ئەوی تریش لەلای چەپیەوە دانیشت، ئینجا وتیان دەستەیەك لە کەس‌وکاری ئێمە هاتوونەتە خاکی تۆ و پشتیان کردوەتە ئێمە، ئەویش وتی ئەوان لە کوێن؟[9134] شتی وا هەیە؟ پێی وترا بەڵێ، نەجاشی وتی بەخوا ناياندەمەوە دەستتان تا قسەیان لەگەڵ نەکەم، ئەوەبوو ناردی بە شوێنیاندا،[9135] جەعفەر بە هاوەڵەکانی وت من لەبری هەمووتان قسە دەکەم، هەموو بە دوای جەعفەردا چوونە ژوورەوە، بە جەعفەریان وت بۆچی کڕنووش نابەیت بۆ پاشا؟ وتی ئێمە تەنها کڕنووش بۆ خوا دەبەین، وتیان بۆچی؟ وتی چونکە خوا پێغەمبەرێکی لەنێوماندا نارد و فەرمانی پێکردین تەنها کڕنووش بۆ خوا بەرین و نوێژ بکەین و زەکات بدەین،[9136] نەجاشی وتی ئەم ئایینەی ئێوە چیە؟ جەعفەریش وتی ئەی پاشا ئێمە گەلێك بووین لەسەر بێباوەڕی بووین و بتمان دەپەرست و مردارەوەبوومان دەخوارد و حەرامەکانمان بە حەڵاڵ دەزانین و خوێنمان ڕەوا دەکرد، ئەوەبوو خوا لە ناو خۆماندا پێغەمبەرێکی بۆ ناردین کە وەفاداری و ڕاستگۆیی و سپاردەکاری ئەومان دەزانی، بانگی کردین تا خوای تاك و تەنها بپەرستین و پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنین و دراوسێیەتیمان باش بێت و نوێژ بکەین و ڕۆژوو بگرین،[9137] عەمر وتی ئەوان سەبارەت بە کوڕی مەریەم و دایکی رایان پێچەوانەی رای ئێوەیە، نەجاشی وتی سەبارەت بە کوڕی مەریەم و دایکی چی دەڵێن؟ جەعفەریش وتی ئەوە دەڵێین کە خوا فەرموویەتی ڕۆح‌و کەلیمەی خوایە کە بەخشیویەتی بە مەریەمی پاکداوێنی بێ هاوسەر کە هیچ مرۆڤێك

٩١٣٣ - صحيح مسلم، الرقم ٤٥٣٨، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٦٧٧، سنن ابن ماجة، الرقم ٤١٢٥، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٩٦٤.

٩١٣٤ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٠٦-٢٠٧.

٩١٣٥ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢١٥.

٩١٣٦ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٠٦-٢٠٧.

٩١٣٧ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢١٥.

دەستی پێی نەگەیشتووە،[9138] نەججاشی وتی هیچتان پێیە لەوەی بۆی دابەزیوە؟ فەرمانیشی کرد بە قەشەکان تا پەرتووکەکانی خۆیان بکەنەوە، جەعفەر وتی بەڵێ، ئەوەبوو بڕێك لە سوورەتی مەریەمی لە سەرەتاوە بۆ خوێندنەوە، نەججاشی دەستی کرد بە گریان تا ریشی تەڕ بوو، قەشەکانیش هەروا گریان تا پەرتووکەکانیان تەڕ بوو،[9139] نەججاشیش دارێکی لەسەر زەوی هەڵگرت و وتی ئەی خەڵکی حەبەشە و قەشەو راهیبەکان ئێوە دەڵێن چی من ئەمەم پێ خراپ نیە، من شایەتی دەدەم ئەو پێغەمبەری خوایەو ئەوەیە کە لە ئینجیلدا هاتووەو عیسا مزگێنی لەبارەوە داوە، سوێند بەخوا ئەگەر من لەم پاشایەتیەمدا نەبوومایە دەچووم بۆ لای و دەبوومە نەعل هەڵگر و ئاوی دەستنوێژیم دەدا، ئینجا بە موسڵمانانی وت بڕۆن لەکوێ دەتانەوێت بمێننەوە، فەرمانیشی کرد دیاریەکانی قورەیشیەکان گێڕدرایەوە.[9140]

ئیبن مەسعوود دواتر لە حەبەشەوە گەڕایەوە بۆ مەککەو لەوێشەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە.[9141]

ئیبن مەسعوود یەکێك بوو لە بەشداربوانی غەزای بەدر، ئەوەتا دەڵێت لە بەدردا من و سەعد و عەممار لە دەستکەوتدا هاوبەش بووین، سەعد خۆی تەنها دوو دیلی پێ بوو، بەڵام ئێمە هیچ دیلێکمان پێ نەبوو.[9142]

سەهلی کوڕی بەیضاء موسڵمانبوونی خۆی ئاشکرا نەکردبوو، بە ناچاری لە جەنگی بەدردا بەشداری کرد و بەدیل گیرا، ئیبن مەسعوود شایەتی بۆ دا کە ئەوی بینیوە لە مەککە نوێژی کردووە، بۆیە بە فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) ئازاد کرا.[9143]

ئیبن مەسعوود لە غەزای ئوحودیشدا بەشداری کرد و تیایدا رۆڵی کارای بینی، بەتایبەت کاتێك موسڵمانان لە دەوری پێغەمبەر (ﷺ) بڵاوەیان کرد، ئیبن مەسعوود یەکێك بوو لەوانەی لە دەوری پێغەمبەر (ﷺ) مایەوە.[9144]

---

٩١٣٨ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٠٦-٢٠٧.

٩١٣٩ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢١٥-٢١٦.

٩١٤٠ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٠٦-٢٠٧.

٩١٤١ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص ٤٦٧.

٩١٤٢ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٠٨.

٩١٤٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ١٩٤.

٩١٤٤ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٦٧.

هەروەها ئیبن مەسعوود لە غەزای خەندەق و بەیعەتی ریضوان و هەموو غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد.[9145]

ئەبوو مووسای ئەشعەری دەڵێت من و براکەم لە یەمەنەوە هاتینە مەدینە، ماوەیەك ماینەوە، ئیبن مەسعوود و دایکیشی هێندە سەردانی ماڵی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) دەکرد واماندەزانی لە ئالوبەیتی پێغەمبەری خوان (ﷺ).[9146]

ئیبن مەسعوود لە کاتی سەفەر و دەرچوونەکانی پێغەمبەریشدا (ﷺ) هاودەمی پێغەمبەر (ﷺ) بوو و خزمەتی دەکرد، نەعلەکانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) هەڵدەگرت و دەیخستە بنباڵی، داردەستەکەی دەدایە دەستی.[9147]

ئیبن مەسعوود هێندە هاودەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو کە دەیوت سوێند بەو خوایەی هیچ پەرستراوێ نیە جگە لەو، چی سوورەتی قورئان دابەزیوە دەزانم لەکوێ دابەزیوە، چی ئایەتی قورئان دابەزیوە دەزانم لەسەر چی دابەزیوە، ئەگەر بزانم کەسێك لە خۆم شارەزاتر بە قورئان هەیە و دەتوانم بە سوار وشتر پێی بگەم دەچووم بۆ لای.[9148]

ئیبن مەسعوود هێندە شارەزا بوو لە خوێندنەوەی قورئاندا کە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو هەرکەس حەز دەکات بە جوانی قورئان بخوێنێتەوە با بە شێوە خوێندنەوەی ئیبن ئوم عەبد-واتە ئیبن مەسعوود-بیخوێنێتەوە).[9149]

ئیبن مەسعوود دەڵێت جارێك پێغەمبەر (ﷺ) بە منی فەرموو قورئانم بەسەردا بخوێنەرەوە، منیش وتم قورئانت بەسەردا بخوێنمەوە لەکاتێکدا بۆ سەر تۆ دابەزیوە؟!، فەرمووی حەز دەکەم لە جگە لە خۆم بیبیستم، منیش سورەتی نیسائم بۆ خوێندەوە تا گەیشتمە (فکیف إذا جئنا من کل إمة

---

٩١٤٥ - أسد الغابة، ج٣، ص ٣٩٦.

٩١٤٦ - صحيح البخاري، الرقم ٣٥٧٥، صحيح مسلم، الرقم ٤٦٠٣، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٢٤، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨١١٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٩١٤٩.

٩١٤٧ - - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٧٠.

٩١٤٨ - صحيح البخاري، الرقم ٤٧٢٠، صحيح مسلم، الرقم ٤٦٠٧.

٩١٤٩ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٧٥، سنن ابن ماجة، الرقم ١٣٧، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٢٨٢٧، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٧٢، صححه أحمد شاكر، ما صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٣٨.

بشهيد و جئنا بك على هؤلاء شهيدا)، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووم بەسە، بینیم چاوەکانی فرمێسکیان دەڕشت.[9150]

عەلی کوڕی ئەبوو طالیب دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە ئیبن مەسعوود تا بچێتە سەر دارێك تا شتێکی لێ داگرێت، ئەویش کە سەرکەوت، هاوەڵان تەماشای قاچی ئیبن مەسعوودیان دەکرد و بە باریکی و رەقەڵانی قاچەکانی پێدەکەنین، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (ما تضحکون؟ لرجل عبد الله أثقل في المیزان یوم القیامة من أحد)،[9151] (بەچی پێدەکەنن؟ دڵنیابن قاچی عەبدوڵا لە ڕۆژی دواییدا لە تەرازوودا زۆر قورسترە لە ئوحود).

ئیبن مەسعوود لە سەردەمی ئەبووبەکری صدیقیشدا ڕۆڵی خۆی بینی، لەوانەش لە جەنگی یەرمووکدا بەشداری کرد.[9152]

ئەبووبەکری صدیق دژبە هەڵگەڕاوەکان جەنگی ڕاگەیاند، بۆ ئەوەش مەترسی لەسەر مەدینە دروست دەبوو، بۆیە پاسەوانی شەوانەی بە دەوری مەدینەدا دانا و بڕێك کەسی کرد بە ئەمیری دەستە دەستەی ئەو پاسەوانانە، لەوانەش عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و زوبەیری کوڕی عەووام و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و عەبدوڵای کوڕی مەسعوود.[9153]

ئیبن مەسعوود لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا لە حیمص نیشتەجێ بوو، دواتر خەلیفە فەرمانی پێکرد بچێت بۆ کووفە.[9154]

عومەری کوڕی خەططاب کاتێك عەمماری کوڕی یاسری نارد تا ببێتە ئەمیری کووفە، ئیبن مەسعوودیشی وەك مامۆستا نارد بۆ خەڵکی کووفە و وتی ئەو لەخۆبوردنەم کردووە کە عەبدوڵام لای خۆم نەهێشتووەتەوەو ناردوومە بۆتان.[9155]

---

٩١٥٠ - صحيح البخاري، الرقم ٤٧٦٩، صحيح مسلم، الرقم ١٣٧٣، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٣٥، سنن أبي داود، الرقم ٣٢٠١، سنن الترمذي، الرقم ٣٠٣٤.

٩١٥١ - مسند أحمدبن حنبل، الرقم ٨٩٢، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٥١٦، قال شعيب الارناؤوط صحيح لغيره و هذا إسناد حسن.

٩١٥٢ - أسد الغابة، ج٣، ص ٣٩٦.

٩١٥٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣١١.

٩١٥٤ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٩١.

٩١٥٥ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٨٥-٤٨٦.

جارێك ئیبن مەسعوود هات بۆ لای عومەری کوڕی خەططاب و خەڵکەکەی لە دەوری کۆبوونەوە، عومەریش پێکەنی و دواتر لەگەڵ ئیبن مەسعوود کەوتە قسەکردن و بە بینینی ئیبن مەسعوود دەموچاوی گەشابوویەوە و زەردەخەنەی بۆ دەکرد، دواتر کە ئیبن مەسعوود چوو عومەر هەر تەماشای دەکرد و دەیوت کووپێکی پڕ لە زانستە.[9156]

لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا عومەری کوڕی خەططاب ماوەی یەك ساڵ ئیبن مەسعوودو چەند هاوەڵێکی تری لە مەدینە بەند کرد تا ئەو کاتەی شەهید بوو، ئینجا عوثمان ئازادی کردن، عومەر لەبەرئەوە بەندی کردن چونکە ئەوانە فەرموودەی زۆریان لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕایەوە.[9157]

ئیبن مەسعوود لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا کە بەرپرسی بەیتولماڵی موسڵمانان بوو لە کووفە، لەگەڵ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص کێشەیەکی بۆ دروست بوو، عوثمانی کوڕی عەففان پاش ماوەیەکی زۆر سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصی لە والیەتی کووفە لابرد، ئەویش لەبەر کێشەیەك کە لەگەڵ ئیبن مەسعوود هەیبوو، چونکە قەرزی لە بەیتولماڵ کردبوو کە ئیبن مەسعوود بەرپرسی بوو، کاتێك ئیبن مەسعوود داوای قەرزەکەی کردەوە لە سەعد، سەعد توانای نەبوو بیداتەوە، بۆیە کێشە کەوتە نێوانیانەوە، هەواڵەکە گەیشتەوە بە عوثمان و سەعدی لابرد و وەلیدی کوڕی عوقبەی لە شوێنیدا دانا.[9158]

کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان نوسخەکانی قورئانی یەکخست و تەنها یەك جۆری هێشتەوە، ئیبن مەسعوود ئامادە نەبوو نوسخەکەی خۆی لاببات چونکە دەیوت من خۆم لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ئەو قورئانەم بیستووە.[9159]

کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان داوای لە ئیبن مەسعوود کرد بگەڕێتەوە بۆ مەدینە، خەڵکی کووفە وتیان لێرە بمێنەرەوە ئێمە ناهێڵین هیچ ئازارێکت پێ بگات، ئەویش وتی من گوێڕایەڵی خەلیفەم

---

[9156] - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٩١.

٩١٥٧ - العواصم من القواصم لابن العربي.

٩١٥٨ - الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٤٧٧.

[9159] - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٨٧-٤٨٨.

لەسەرە، دەبینم فیتنە بەڕێوەیە، نامەوێت من یەکەم کەس بم ئەو دەرگایە بکاتەوە، بۆیە خەڵکەکەی گێڕایەوەو بەرەو مەدینە کەوتەڕێ.[٩١٦٠]

لە ساڵی سی و دووی کۆچی و لە مانگی ذیلحیججەدا[٩١٦١] ئیبن مەسعوود لە مەدینەوە بەرەو کووفە دەچوو، ئەوکات ئەبووذەر لە ناوچەی رەبذە کۆچی دوایی کرد، داوا کرا لە ئیبن مەسعوود نوێژی لەسەر بکات، ئەویش وتی ئەوە کێیە؟ وترا ئەبووذەرە، ئەویش گریانێکی زۆر گریا و وتی برا و کەسی خۆشەویستم بە تەنها ژیا و بە تەنها مرد و بە تەنهاش زیندوو دەکرێتەوە، خۆشبەختی بۆی.[٩١٦٢]

رۆژێك ئیبن مەسعوود کابرایەکی بینی، کابرا پێی وت ئەمشەو خەوم بینی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر مینبەرێکی بەرز بوو و تۆیش لە خواروویەوە بوویت، دەیفەرموو ئەی ئیبن مەسعوود سەرکەوە بۆ لام دوای من جەفات پەیدا کرد، ئیبن مەسعوود وتی توخوا ئەو خەوەت بینی؟ کابرا وتی ئەرێ، ئیبن مەسعوود وتی دەی دڵنیام تۆ لە مەککە دەرناچیت تا من دەمرم و تۆیش نوێژم لەسەر دەکەیت، هەروایش بوو.[٩١٦٣]

پاش ماوەیەك ئیبن مەسعوود نەخۆش کەوت، عوثمانی کوڕی عەففان هات بۆ لای، وتی ئازاری چیت هەیە؟ ئەویش وتی ئازاری تاوانەکانم، وتی ئەی حەز بە چی دەکەیت؟ وتی رەحمەتی پەروەردگارم، وتی ئەی فەرمان نەکەم پزیشکێك بێت بۆ لات، وتی پزیشك دەوای کردووم، عوثمان وتی فەرمان نەکەم بەخششت بکەن؟ وتی هیچ پێویستم پێی نیە.[٩١٦٤]

دواجار ئیبن مەسعوود لە مەدینەو لە ساڵی سی و دووی کۆچیدا وەفاتی کرد، رایەکیش دەڵێت لە ساڵی سی و سێی کۆچیدا وەفاتی کرد، ذەهەبی دەڵێت لەوانەیە لە سەرەتای ساڵی سی و سێی کۆچیدا بووبێت، تەمەنیشی شەست و سێ ساڵان دەبوو.[٩١٦٥]

کاتێك وەفاتی کرد نوێژی لەسەر کرا، رایەك دەڵێت عوثمانی کوڕی عەففان نوێژی لەسەر کرد، رایەکیش دەڵێت عەمماری کوڕی یاسر نوێژی لەسەر کرد، رایەکیش دەڵێت زوبەیری کوڕی عەووام

---

[٩١٦٠] - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٨٩.

٩١٦١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٦٥.

٩١٦٢ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٥٣.

[٩١٦٣] - أسد الغابة، ج٣، ص ٣٩٩.

[٩١٦٤] - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٩٨.

[٩١٦٥] - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٩٩.

نوێژی لەسەر کرد، وەستان تا شەو، چونکە خۆی وەسیەتی کردبوو شەو ئەسپەردەی بکەن، ئینجا لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردەیان کرد.[9166]

ئیبن مەسعوود لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) خۆشەویستی زۆری هەبوو و قسەی وەرگیراو بوو، جارێك ئیبن مەسعوود چوو بۆ لای خەبابی کوڕی ئەرەت، خەبابیش خاتەمێکی زێڕی دەکردە پەنجەی، ئیبن مەسعوود وتی ئیتر کاتی نەهاتووە ئەو خاتەمە فڕێ بدەیت؟ خەبباب وتی جارێکی تر نایبینیت لە دەستما.[9167]

ئەبوو مووسای ئەشعەری دەیوت لە کۆڕێکی ئیبن مەسعووددا دابنیشتمایە لە کاری یەك ساڵ لام گرنگتر بوو.[9168]

موعاذ دەیوت زانست لای چوار کەس وەربگرن، لای ئەبوودەرداء  و سەلمان و ئیبن مەسعوود و ئیبن سەلام.[9169]

ئیبن مەسعوود دەیوت زۆر رقمە کەسێك ببینم دەست بەتاڵ بێت، نە خەریکی کاری دنیای بێت و نە خەریکی قیامەتی بێت.[9170]

هەروەها دەیوت رازی بە بەوەی خوا بۆی داناویت دەوڵەمەندترین کەس دەبیت.[9171]

---

[9170] - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٩٦.

[9171] - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٩٧.

٩١٧٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٢٣٦.

## خەدیجەی کچی خوەیلید(دایکی باوەڕداران) (رضي الله عنها)

ناوی خەدیجەی کچی خوەیلیدی کوڕی عەبدولعوززای قوڕەیشی ئەسەدیە،[٥٤٠٨] خێزانی یەکەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و یەکەم ئافرەتی موسڵمان بووە، دایکی ناوی فاطیمەی کچی زائیدەیە.[٥٤٠٩]

---

خەدیجە برایەکی هەبوو بە ناوی عەووام کە باوکی زوبەیر و سائیب بوو.[٥٤١٠]

## خەدیجە(رضي الله عنها) پێش هاوسەری لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)

خەدیجە سەرەتا هاوسەری ئەبی هالەی کوڕی زورارە بوو، دوای ئەو شووی کرد بە پیاوێکی تر کە ناوی عەتیقی کوڕی عابید بوو، ئەو پیاوەی مرد ئینجا هاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کرد.[٥٤١١]

خەدیجە لە مێردی یەکەمی کوڕێکی هەبوو بە ناوی هالە کە هاوەڵی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)،[٥٤١٢] لە مێردی دووەمی کچێکی هەبوو بە ناوی هیند.[٥٤١٣]

خەدیجە لەناو هۆزەکەیدا زۆر ناسراو بوو، چونکە هەم لە خێزانێکی ناسراو بوو، هەم سامانێکی زۆر زۆری هەبوو و هەموان حەزیان دەکرد ئەو ئافرەتە بخوازن.[٥٤١٤]

خەدیجە هێندە بە پاکداوێن ناسرابوو کە لەناو هۆزەکەیدا بە ئافرەتە پاکەکە ناوی دەرچووبوو.[٥٤١٥]

## سەرەتای یەکترناسین

خەدیجە سامانێکی زۆری هەبوو، بۆیە داوای لە پیاوانێکی شارەزا دەکرد تا کاری بازرگانی بۆ بکەن، بەرامبەر بەوە بڕێك قازانجی دەدا پێیان، جا کاتێك راستگۆیی و دەستپاکی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بیست بڕیاریدا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) مامەڵە بکات،[٥٤١٦] بۆیە داوای کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) تا کاری بازرگانی بۆ بکات، پێغەمبەریش (ﷺ) رازی بوو، ئەوکات هێشتا نەبووبوو بە پێغەمبەر و لە تەمەنی لاویدا بوو، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ مەیسەرەی مەولای خەدیجەدا چوو بۆ شام تا کاری بازرگانی

---

٥٤٠٨ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٠.
٥٤٠٩ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٠.
٥٤١٠ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١١٩.
٥٤١١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٠.
٥٤١٢ - أسد الغابة، ج٥، ص ٣٩٣.
٥٤١٣ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٥.
٥٤١٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ١٣١.
٥٤١٥ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٥.
٥٤١٦ - أسد الغابة، ج٧، ص ٩٠.

بکات بۆ خەدیجە، کە گەیشتنە شام پێغەمبەر (ﷺ) لە ژێر سێبەری دارێکدا دانیشت، کابرایەکی راهیب ئەوی بینی، بە مەیسەرەی وت ئەم کابرایە کێیە؟ ئەویش وتی کەسێکی قورەیشیە، راهیبەکە وتی تەنها پێغەمبەران لەژێر سێبەری ئەم دارەدا دانیشتون، ئینجا وتی ئایا سوورایییەك لەنێوچاوانیدا هەیە؟ مەیسەرە وتی بەڵێ، راهیبەکە وتی دەی هەرگیز لێی جیا مەبەرەوە، ئەە کۆتای پێغەمبەرانە و خۆزگە منیش دەگەیشتمە کاتی پێغەمبەرایەتیەکەی، ئینجا کە هاتنەوە خەدیجە قازانجی زۆر زۆری دەکرد لەو کارەی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها مەیسەرە ئەو قسەی راهیبەکەشی بۆ خەدیجە گێڕایەوە،[٥٤١٧] ئەوەبوو دڵی چوویە سەر پێغەمبەر (ﷺ) و پێشنیازی خۆی کرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) تا ببێتە هاوسەری.[٥٤١٨]

## پێشنیاری خەدیجە(رضي الله عنها) بۆ هاوسەرگیری

سەبارەت بە جۆری پێ وتنەکە بە پێغەمبەر (ﷺ) چەند گێڕانەوەیەك هاتووە:

عەمماری کوڕی یاسر دەڵێت: جارێك لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەچووین بەڕێدا و خوشکەکەی خەدیجەمان بینی دامان بە لایدا لەسەر پێستەیەك بوو دەیفرۆشت، کە منی بینی بانگی کردمە کەنارەوە، پێی وتم ئەرێ هاوڕێکەت رای چۆنە بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ خەدیجە؟ منیش چووم و ئەوەم بە پێغەمبەر (ﷺ) وت، ئەویش فەرمووی: بەڵێ بەخوا پێم خۆشە، هەواڵەکەم دایەوە بە خوشکەکەی خەدیجەو ئەویش وتی دەی بۆ بەیانی وەرن، ئێمەش چووین و سەیرمان کرد مانگایەکیان سەربڕیوەو جلی جوانیان کردوەتە بەر باوکی خەدیجە، منیش بە خوشکەکەیم وت ئەویش بە باوکی وت، باوکیشی ئەوکات سەرخۆش بوو، خوشکەکەی خەدیجە وتی موحەممەد هاتوەتە داوای خەدیجەو ئەویش رازی بوو و خەدیجەی لێ مارە کرد، لە گۆشتەکە خواردنێکیان ئامادە کرد و هەموان نانیان خوارد و باوکی خەدیجە خەوت، دواتر کە لە خەو هەستا هاواری کرد ئەم جلانە چین؟ ئەم خواردن و بەزمە چیە؟ کچەکەی پێی وت ئەو جلە هی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵایەو ئەو مانگایەی بە دیاری بۆ هێناویت و تۆیش کە خەدیجەت لێ مارە کرد ئەو ماگایەمان سەربڕی، بەڵام خوەیلید نارازی بوو و کەوتە بۆڵەو هاوارکردن.[٥٤١٩]

---

٥٤١٧ - دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٠٦.

٥٤١٨ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٤.

٥٤١٩ - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٢٨٤٠، البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٥-٢٩٦، البحر الزخار، الرقم ١٢٦٢.

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) و مەیسەرە گەڕانەوەو مەیسەرە باسی قسەی راهیبەکەی کرد، خەدیجە کەسێکی نارد بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و پێی وت پێی بڵێت:(ئەی ئامۆزا من دڵم چوەتە سەر تۆ لەبەر نزیکی و خزمایەتیت لێم، لەبەر کەسایەتی و نێوەندبوون و سپاردەکاریت لەنێو هۆزەکەتدا، لەبەر رەوشت حوانی و راستبێژیت)،[٥٤٢٠] ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) چوو لای مامەکانی مەسەلەکەی باس کرد و دواتر حەمزەی مامی لەگەڵی چوو بۆ لای خوەیلید و داوای خەدیجەی کرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش مارەی کرد لێی.[٥٤٢١]

نەفیسە کە ئافرەتێکە دەڵێت: خەدیجە منی نارد بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) تا پیشنیازی بۆ بکەم داخوازی خەدیجە بکات و هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، منیش هەمان کارم کرد و چووم بۆ لای و وتم بۆچی هاوسەرگیری ناکەیت؟ فەرمووی  هیچێکم لەدەستدا نیە تا هاوسەرگیری بکەم، وتم ئەگەر من ئەوەم بۆ چارەسەر کردیت و ئافرەتێکی لێهاتوو و دەوڵەمەند و جوانیش هەبوو بیهێنیت، فەرمووی کێیە؟ وتم خەدیجەیە، پێغەمبەریش (ﷺ) رازی بوو.[٥٤٢٢]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) داوای خەدیجەی کرد مامی خەدیجە عەمری کوڕی ئەسەد خەدیجەی لە پێغەمبەر (ﷺ) مارە کرد، رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو عەمری برای خەدیجە مارەی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ).[٥٤٢٣]

## کات و تەمەنی هاوسەرگیریەکە

سەبارەت بە کاتی هاوسەرگیری خەدیجەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند رای جیاواز هاتووە، رایەکیان دەڵێت: ئەوکات خەدیجە تەمەنی چل ساڵان بووە، رایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو تەمەنی بیست و هەشت ساڵان بووە،[٥٤٢٤] رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو تەمەنی خەدیجە ئەوکات سی و پێنج ساڵان بووە، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو بیست و پێنج ساڵان بوو.[٥٤٢٥]

---

٥٤٢٠ - دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٣٩٤.

٥٤٢١ - أسد الغابة، ج٧، ص ٩١.

٥٤٢٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٢.

٥٤٢٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٦.

٥٤٢٤ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١١.

٥٤٢٥ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٥.

سەبارەت بە تەمەنی پێغەمبەریش (ﷺ) رایەك دەڵێت: تەمەنی بیست و یەك ساڵان بووە، رایەکی تریش دەڵێت: تەمەنی بیست و پێنج ساڵان بووە.[٥٤٢٦]

ماوەی پێکەوە ژیانیشیان نزیکەی بیست و پێنج ساڵ بووە، چونکە بە گونجاندنی کاتی هاوسەرگیریەکەو تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) و کاتی وەفاتی خەدیجەدا دەزانین نزیکەی بیست و پێنج ساڵ پێکەوە ژیاون.

## وەستانێك:

لەبەرئەوەی دەقێکی روونی صەحیح نیە سەبارەت بە تەمەنی خەدیجەی کچی خوەیلید لە کاتی هاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)، بۆیە شیکاریەکی بۆ دەکەین:

یەکەم: تەمەنی خەدیجە چل ساڵان نەبووە، چونکە ئافرەت لە تەمەنی چل ساڵ بە دواوە ئەگەری منداڵ بوونی زۆر کەم دەکات، چ جای ئەوەی چەند منداڵێکی ببێت، پێغەمبەریش (ﷺ) پاش پانزە ساڵ لەو هاوسەرگیریە ئینجا بوو بە پێغەمبەر (ﷺ) تا بڵێین موعجیزەیەکی خودایی بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و هیچ دەقێکیش لەو بارەوە نیە.

دووەم: دیارە خەدیجە زۆر گەنجیش نەبووە، ئەمەش بەپێی ئەو دەقەی کە عائیشە دەڵێت: کە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر باسی خەدیجەی دەکرد دەموت چیە هێندە باسی ئەو پیرەژنە قورەیشیە دەکەیت،[٥٤٢٧] هەروەها لەبەرئەوەی پێشتر دوو جار شووی کردووەو دوو منداڵیشی هەبووە.

سێیەم: ئەگەر تەماشا بکەین لە سەرچاوەکاندا چوار تەمەن هاتووە(بیست و پێنج، بیست و هەشت، سی و پێنج، چل)، کەچی ئەوەی چل ساڵەکە زەق کراوەتەوە، هۆکارەکەشی چیە؟!

## ژیانی ژن و مێردایەتی

خەدیجە لە ماوەی ژیانی لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) تەنانەت لەو کاتەش کە پێغەمبەر نەبوو زۆر رێزی دەگرت لێی و بە گەورە تەماشای دەکرد و پێغەمبەر (ﷺ) هەر چی بفەرمواية ئەو بڕوای پێدەکرد،[٥٤٢٨] هەڵسوکەوتێکی ژنێکی سەلار بەرامبەرمێردێکی سەلار.

---

٥٤٢٦ - أسد الغابة، ج٧، ص ٩٠.

٥٤٢٧ - صحيح البخاري، الرقم ٣٦٣٣.

خەدیجە خزمەتکارێکی کڕیبوو بە ناوی زەیدی کوڕی حارثە، هێشتا پێغەمبەر (ﷺ) سروشی بۆ دانەبەزیبوو، بەڵام خۆشەویستی بۆ زەید زۆر بوو، خەدیجە کە بینی پێغەمبەر (ﷺ) زەیدی زۆر خۆشدەوێت زەیدی پێ بەخشی.[٥٤٢٩]

## وەستانێك:

گومانێك لەلایەن رۆژهەڵاتناسانەوە سەبارەت بە هاوسەرگیری پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ خەدیجە خراوەتەڕوو گوایە مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) لەو هاوسەرگیریەدا بریتی بووە لە دەستکەوتی ماددی تا ببێتە بنەڕەت بۆ بانگەوازی داهاتووی، بەڵام ئەمە لە چەند روویەکەوە ناراستی ئەو مەسەلەیە دەخاتەڕوو:

یەکەم: پێغەمبەر (ﷺ) ئەوکات نەیدەزانی دەبێتە پێغەمبەری خوا و هیچ ئاگاداریەکی نەبوو، ئەگەریش بڵێت وەك کەسێکی کاریزما جووڵاوەتەوە ئەمە بڕوا نەبوونە بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) و کردنیەتی بە کاریزمایەکی ناو مرۆڤایەتی نەك پێغەمبەرێکی خوا، بۆ ئەوانەش وا دەڕوانن هەر لەوەدا هەڵەن، چونکە مێژوو بە کۆدەنگی پاکداوێنی پێغەمبەری خوای (ﷺ) سەلماندووەو لە گەرمەی گەنجێتیدا نەچووە بە لای هیچ چێژوەرگرتنێکی جنسیدا، لەکاتێکدا ئەگەر هاوسەرگیریەکەی بۆ ماددە بوایە ئەوە دەبوو بە نهێنی و یان هەر بە ئاشکراش خۆی بێبەش نەکردایە لە یەکەم چێژی رازێنراوەی سەر زەوی وەك خوا فەرموویەتی: (زين للناس حب الشهوات من النساء...)، بەڵکو دەبینین تا ئەو کاتەی خەدیجە وەفات دەکات پێغەمبەر (ﷺ) هیچ ژنێکی تر ناهێنێت و تەنانەت لە سەردەمی پێش پێغەمبەرایەتیشیدا سەیرێکی ئافرەتێکی تریشی نەکردووە، دەی خەدیجە لە ساڵی سێیەمی پێش کۆچیدا وەفاتی کردووە، واتە ئەوکات تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) نزیکەی پەنجا ساڵ بووە، واتە نزیکەی بیست و پێنج ساڵ پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ خەدیجە ژیا کەچی جارێکیش بیری نەکردەوە لە هاوسەرگیریەکی تر، لەکاتێکدا پاش ئەو ژنی زۆری هێنا، بۆیە ئەوە تەنها کینەیەکی بڕوانەبوونە بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) و لەو پێناوەشدا هەر هەنگاوێك دەگرنەبەر با ناحەقیش بێت.

---

٥٤٢٨ الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٣.

٥٤٢٩ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٤.

## باوەڕهێنانی خەدیجە(رضي الله عنها)

خەدیجە یەکەم کەس بوو باوەڕی هێنا بە پێغەمبەر (ﷺ)،[٥٤٣٠] ئەمەش کۆدەنگی هەموو موسڵمانانی لەسەرە.[٥٤٣١]

کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) سروشی بۆ دابەزی جۆرێك لە دڵەخورپێ دایگرت و گەڕایەوە ماڵەوە بۆ لای خەدیجەی کچی خوەیلیدی خێزانی، فەرمووی: (داميۆشن، داميۆشن)، دایانپۆشی تا حاڵی ئاسایی بوویەوە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) بارەکەی گێڕایەوە بۆ خەدیجەو فەرمووی: (لقد خشيت على نفسي)، (بەراستی لە حاڵی خۆم دەترسم)، خەدیجەش پێی وت: نەبەخوا هەرگیز خوا سەرشۆڕ و شکت خواردەت ناکات، چونکە تۆ پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنیت و ئەرکی قورس و هاوکاری لەئەستۆ دەگریت و دەستگرۆیی هەژار و مایەپووچان دەکەیت و ڕێزی میوان دەگریت و خزمەتی دەکەیت و پاڵپشت و دڵدەرەوەی بارشێواوانیت، ئینجا پاش ئەو دڵدانەوەیە، خەدیجە پێغەمبەری خوای (ﷺ) برد بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کە کابرایەکی نەصرانی بوو و نووسینی عیبرانیشی دەزانی، کابرایەکی پیری نابینا بوو، خەدیجە پێی وت ئامۆزاکەم گوێ لە برازاکەت بگرە، وەرەقە بە وردی گوێی گرت لە پێغەمبەر (ﷺ) و دواجار پێی وت کە ئەو بووە بە پێغەمبەر (ﷺ).[٥٤٣٢]

## گەورەییەکانی خەدیجە(رضي الله عنها)

جارێك خەدیجە خواردنی ئامادە کردبوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و چوو بەرەو بەرزاییەکانی مەککە تا خواردنەکەی بۆ ببات، لە ڕێدا جبرەیل خۆی لە شێوەی مرۆڤێکدا نیشان دا و پرسیاری پێغەمبەری خوای (ﷺ) لە خەدیجە کرد، خەدیجەش ترس دایگرت و ترسا کەسێکی خراپ بێت و نیازی کوشتنی پێغەمبەری خوای (ﷺ) هەبێت، دواتر کە خەدیجە چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی (ئەوە جبرەیل بوو، فەرمانی پێکردم سەلامت پێ بگەیەنم)، ئینجا موژدەی دا بە خەدیجە کە لە بەهەشتدا خانوویەکی بێ ژاوەژاوو ماندووبوونی بۆ تایبەت کراوە.[٥٤٣٣]

---

٥٤٣٠ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٠٩.

٥٤٣١ - أسد الغابة، ج٧، ص ٨٩.

٥٤٣٢ - صحيح البخاري، الرقم ٣، صحيح مسلم، الرقم ٢٥٧، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٣، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥٢٩٧.

٥٤٣٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٣-٦٠٤.

خەدیجە پشتیوانێکی گەورە بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵکو هەرکات پێغەمبەر (ﷺ) لە دەرەوە بە دەست بێباوەڕانەوە قسەی ناخۆشی بەرامبەر بکرایە، کە دەگەڕایەوەماڵەوە خەدیجە دڵی هێور دەکردەوەو خەفەتی سەر شانی لادەبرد.[٥٤٣٤]

خەدیجە دایکی هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو جگە لە ئیبراهیم کە لە ماریە بوو.

خەدیجە ئەم منداڵانەی لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو:(قاسم کە کوڕە گەورەی بوو، عەبدوڵا ناسراو بە طەیبو طاهیر، روقییە کە کچە گەورەی بوو، زەینەب، ئوممولکلثوم، فاتیمە)،[٥٤٣٥] هەموو کوڕەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە خەدیجەوە پێش دابەزینی سروش وەفاتیان کرد، بەڵام کچەکانی مانەوە تا ئیسلام هات و باوەڕیان هێنا بە ئیسلام و کۆچیان کرد بۆ مەدینە.[٥٤٣٦]

خەدیجە زۆر خواناس بوو، پێغەمبەر (ﷺ) موژدەی پێدابوو کە لە بەهەشتدا خانوویەکی هەیە.[٥٤٣٧]

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو:(إن أفضل نساء أهل الجنة خديجة بنت خويلد و فاطمة بنت محمد و مريم بنت عمران و آسية بنت مزاحم إمراة فرعون)،[٥٤٣٨] (چاکترین ئافرەتانی بەهەشت بریتین لە خەدیجەی کچی خوەیلید و فاطیمەی کچی موحەممەد و مەریەمی کچی عیمران و ئاسیەی کچی موزاحیم کە ژنی فیرعەون بوو).

جارێك جیبریل هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و فەرمووی: : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە خەدیجەیە دێت بۆ لات و قاپێکی پێیە کە خواردنی تێدایە، ئەگەر هات بۆ لات سەلامی پەروەردگاری و

---

٥٤٣٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٠.

٥٤٣٥ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٤.

٥٤٣٦ - أسد الغابة، ج٧، ص ٩١.

٥٤٣٧ - صحيح مسلم، الرقم ٤٥٦٦.

٥٤٣٨ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٢٠، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٧٧١، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٠٨٠، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٧٨٧، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٩٠٩، صححه الذهبي في التلخيص، كما صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ١٥٠٧.

منی پیّ بگەیەنە و موژدەی بدەریّ بە خانوویەك لە بەهەشتدا کە مرواریەو هیچ ژاوەژاو و ماندووبوونێکی تێدا نیە.[٥٤٣٩]

خەدیجە لە هەموو نارەحەتیەکاندا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بوو، تەنانەت لە گەمارۆدانی سەختی هاشمیەکانیشدا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لە شیوەکەدا بوو، جارێك حەکیمی کوڕی حیزام ویستی برێك گەنم بەرێت بۆ خەدیجەی پووری، بەڵام ئەبووجەهل ڕێی پێگرت، ئەبولبوختەری هات و وتی ئەوە چیتانە؟ ئەبووجەهل وتی ئەمە خواردن دەبات بۆ هاشمیەکان، ئەبولبوختەری وتی بۆ پووری خۆی دەبات ڕێی ئەوەشی لیّ ئەگریت؟ ڕێی بۆ چۆڵ کە کابرا، بەڵام ئەبوجەهل ڕازی نەبوو، بۆیە کەوتنە دەمەقاڵەو دەستەویەخە.[٥٤٤٠]

## کۆچی دوایی خەدیجە(رضي الله عنها)

سەبارەت بە کاتی مردنی خەدیجە چەند گێڕانەوەیەك هاتووە، لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە گێڕدراوەتەوە کە خەدیجە پێش فەرزبوونی نوێژ وەفاتی کردووە، دەوترێت لە مانگ ڕەمەزاندا کۆچی دوایی کردووە، ڕایەك دەڵێت: سیّ ساڵ پێش کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مەدینە کۆچی دوایی کردووە.[٥٤٤١]

ڕایەك دەڵێت کاتێك خەدیجە وەفاتی کرد تەمەنی نزیکەی شەست و پێنج ساڵ دەبوو،[٥٤٤٢] ئەمەش بە پشت بەستن بەو گێڕانەوەی کە دەڵێت: خەدیجە لە تەمەنی چل ساڵیدا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) هاوسەرگیری کردووە.

حاکم لە موستەدرەکدا دەڵێت: ئەم وتەیە شازە، چونکە ئەوەی لای منە(بەڵگە) ئەوەیە کە تەمەنی نەگەیشتوەتە شەست ساڵان.[٥٤٤٣]

---

٥٤٣٩ - صحيح البخاري، الرقم ٣٦٣٢، صحيح مسلم، الرقم ٦٩٧٥، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١١٩، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٦٩٧٥، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٩١٨.

٥٤٤٠ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٨٨.

٥٤٤١ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٧.

٥٤٤٢ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٢.

٥٤٤٣ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٧٩٠.

سەبارەت بە ماوەی نێوان مەرگی خەدیجەو ئەبوو طالیب رایەك دەڵێت: خەدیجە تەنها دوای سێ رۆژ لە مەرگی ئەبووطالیب کۆچی دوایی کرد، رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو خەدیجە سی و پێنج رۆژ پێش ئەبووطالیب کۆچی دوایی کرد.[٥٤٤٤]

## خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خەدیجە(رضي الله عنها) پاش مردنیشی

خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خەدیجە بە مەرگی خەدیجە کۆتایی پێ نەهات، بەڵکو زۆرجار بە چاکە باسی دەکرد، ئەمەش چەند نموونەیەك لە خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خەدیجە لە دوای مردنی:

خەولەی کچی حەکیم دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەتبینم بە مەرگی خەدیجە بۆشاییەك کەوتۆتە ژیانتەوە، ئەویش فەرمووی: (بەڵێ، ئەو دایکی منداڵەکان و خاتوونیماڵەوە بوو).[٥٤٤٥]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) زۆر جار باسی خەدیجەی دەکرد، کاتێك ئاژەڵێکی سەردەبڕی بەشی هاوڕێکانی خەدیجەی جیا دەکردەوەو دەستی بگەیشتایەتە لای هەرکامیان بۆی دەنارد.[٥٤٤٦]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت ئەو غیرەی بەرامبەر خەدیجە هەمبوو بەرامبەر هیچ کەسی تر هێندە نەمبوو، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر زۆر باسی دەکرد.[٥٤٤٧]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) کە گۆشتی دەنارد بۆ هاوڕێکانی خەدیجەو هێندەش زۆر باسی خەدیجەی دەکرد، وام لێدەهات دەموت ئەڵێیت هەر خەدیجە ژن بووە، پێغەمبەریش (ﷺ) دەیفەرموو: ئەو ئاواو و ئاوا بوو و من لەو منداڵم هەبوو).[٥٤٤٨]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: جارێك هالەی خوشکی خەدیجە هاتە بەردەرگا، کە پێغەمبەر (ﷺ) زانی هالەیە خێرا راپەڕی و فەرمووی: : (اللهم هاله) (ئای خوایە هالە هاتووە)، منیش غیرە

---

٥٤٤٤ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٢.

٥٤٤٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٣، قال الحافظ ابن حجر وسنده قوي مع إرساله.

٥٤٤٦ - صحيح البخاري، الرقم ٣٦٢٨.

٥٤٤٧ - صحيح البخاري، الرقم ٣٦٢٩.

٥٤٤٨ - صحيح البخاري، الرقم ٣٦٣٠.

دایگرتم و وتم چیە ئەوەنە باسی ئەو پیرەژنە قورەیشیە دەکەیت،[٥٤٤٩] پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەوەی لێ بیستم دەموچاوی تووڕە و شێواو هەڵگەڕا.[٥٤٥٠]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: کاتێك ناوی خەدیجە دەبرا ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) زۆر وەسفی دەکرد و زۆر یادی دەکردەوە، منیش ڕۆژێك غیرەم هەبوو وتم چیە ئەوەنە باسی ئەو لاجانگ سوورە ئەکەیت خوا لە بری ئەو چاکتری پێ بەخشیویت، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: (ما أبدلني الله عز وجل خيرا منها، قد آمنت بي إذ كفر بي الناس، وصدقتني إذ كذبني الناس، وواستني بمالها إذ حرمني الناس، ورزقني الله عز وجل ولدها إذ حرمني أولاد النساء)،[٥٤٥١] (خوای گەورە لەو چاکتری پێ نەبەخشیوم، خەدیجە کاتێك باوەڕی پێ هێنام کە خەڵکی بڕوایان پێ نەدەهێنام، بەراستی زانیم کاتێك خەڵکی بە درۆیان دەخستمەوە، کاتێك خەڵك بێبەشیان دەکردم ئەو بە سامانەکەی دڵنەوایی و پاڵپشتی دەکردم، خوای گەورە لەو منداڵی پێ بەخشیم کەچی لە ژنەکانی ترم لە منداڵ بێبەشی کردم).

## پەندو وانە:

هاوسەرگیری پرۆسەیەکی شەرعیە کە خوای گەورە دایناوە لەنێوان نێر و مێدا ڕوودەدات، ئەوەش ویستێکی کاتی نیەو بەس، بەڵکو فەرمانی خوایی لەسەرەو هەر کەسیش لەو مەیدانەدا کەمتەرخەمی کردبێت نابێتە بیانوو بۆ ڕەوایی دەستبەردار بوون لە هاوسەرگیری، ئەگەر هاتو جەستە کامڵ بوو و عەقڵ تەواو بوو و کەسەکە توانای هاوسەرگیری هەبوو، ئیتر خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بە دەستەواژەی فرمان کردن ڕێی هاوسەرگیری پێ نیشان دەدەن، هەروەها مەسەلەیەکی تریش کە گرنگە لە هاوسەرگیریدا پاراستنی ئاییندارى تاکە، چ کوڕ کە ئافرەتێك هەڵدەبژێرێت هەڵبژاردنەکەی دەبێت بۆ ئافرەتێکی ئاییندار بێت کە هەم پێکەوە بگونجێن و هەم منداڵەکان لەسەر بیروباوەڕێکی چاك پەروەردە بکات، بۆیە خوا دەفەرمویت: (وأمة مؤمنة خير من مشركة و لو أعجبتكم)، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویت: (فاظفره بذات الدين تربت يداك)،[٥٤٥٢] چ ئافرەتیش دەبێت دەبێت زۆر زیاتر ڕەچاوی

---

٥٤٤٩ - صحيح البخاري، الرقم ٣٦٣٣.

٥٤٥٠ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١١٨.

٥٤٥١ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٤٣٠٩، قال الذهبي في البداية والنهاية (ج٣، ص ١٢٨) إسناده لا بأس به، صححه شعيب الأرناؤوط.

٥٤٥٢ - صحيح البخاري، الرقم ٤٨٠٢، صحيح مسلم، الرقم ٢٧٣٩، سنن أبي داود، الرقم ١٧٦٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٠٩٩، سنن ابن ماجة، الرقم ١٨٥٤، سنن الدارمي، الرقم ٢١٣٩، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥١٩٣، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٩٣١٧.

ئەو خاڵە بکات، چونکە ئافرەت زۆر زووتر کاریگەر دەبێت بە بیرکردنەوەو رامانی هاوسەرەکەی، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویت: (إذا أتاكم من ترضون خلقه ودينه فزوجوه)،[٥٤٥٣] (ئەگەر کەسێك هاتە داوای کچەکەتان، لە ئاکار و ئایینداریەکەی رازی بوون ئەوە لێی مارە بکەن).

هەر سەبارەت بە هاوسەرگیری بابەتێك هەیە کە لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆدا زەق کراوەتەوەو وەك تانەیەك دانراوە، ئەویش پێشنیازی هاوسەرگیریە لەلایەن ئافرەتەوە، ئیتر یان کەسی بەرامبەر ئەوە بە کەمی کچەکە دەزانێت، یان کۆمەڵگە تانەی لێدەدات، بەڵام لە راستیدا شەریعەت وا ناڵێت، هەر بە دیدە عەقڵیەکەشی تەماشا بکرێت، ئافرەتێك بە چەندەها ساڵ ماندووبوون تا پەروەردەیەکی تەواوی ئایینی و رەوشتی و کۆمەڵایەتی وەرگرتووە، ئەگەر بیەوێت هەم ژیانێکی بەختەوەرانەی بۆ باجدانی هەبێت و هەم ئەو دەستکەوتانەشی بپارێزێت، چاکترین رێچارە ئەوەیە بە دڵی خۆی کوڕێك هەڵبژێرێت کە هەم بەختەوەری پێکەوە ژیانی لێ بەدی بکات، هەم هۆکاری پاراستنی ئەو دەستکەوتانەی بێت، ئەمە نەك کەموکورتی نیە، بەڵکو گەورەییە کە ئەو ئافرەتە دەیەوێت دەستکەوتەکانی دنیا و قیامەتی بپارێزێت، بەڵام باشتر وایە لە رێی کەسێکی دڵسۆزەوە ئەو پێشنیازە بگەیەنێت بە کوڕەکە، هەم بۆ دروست نەبوونی گومان لای ئەو کوڕە کە لەوانەیە جار هەبێت ئەوە بە شتێکی تر لێکبداتەوە، هەم بۆ ئەوەی ئەگەر نەگونجا ئافرەتەکە پێی نەشکێتەوە، چونکە ئەوان دڵیان ناسکە و هەستیارن، پێغەمبەریش (ﷺ) بە شووشەیی ناوی بردون (رويدك بالقوارير).[٥٤٥٤]

پێویستە هاوسەرەکان لە خۆشی و ناخۆشیەکاند پشت و هاودەمی یەکدی بن، نەك لە خۆشیەکاندا دۆستی یەك و لە ناخۆشیەکاند دڵسۆزێکی ناچار بە کەنارگیری بن، خەدیجەی دایکی باوەڕداران جوانترین نموونە بوو، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم جۆرە پێناسی دەکات: (خەدیجە کاتێك باوەڕی پێ هێنام کە خەڵکی بڕوایان پێ نەدەهێنام، بەراستی زانیم کاتێك خەڵکی بە درۆیان دەخستمەوە، کاتێك خەڵك بێبەشیان دەکردم ئەو بە سامانەکەی دڵنەوایی و پاڵپشتی دەکردم)، تا دوا ساتەکانی ژیانیشی هاودەمی نارەحەتیەکانی هاوسەرەکەی بوو، ئیتر هیچ کات بیری لەوە نەدەکردەوە منێکی دەوڵەمەندی خاوەن ناوبانگ لەپێناو چیدا ئەم هەموو باجە بدەم، بەڵکو ئەوەی لای گرنگ بوو هاودەمی مێردی خواناسی بێت.

---

٥٤٥٣ - سنن ابن ماجة، الرقم ١٩٦٣، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٩٦٧.

٥٤٥٤ - صحيح البخاري، الرقم ٥٨١٥، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١١٨٥٤.

وەفاداری پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خەدیجە نموونەیەکی باڵای وەفاداری نێوان ژن و مێردە، وەفادارییەك کە دوای مردنیشی هێشتا هەمان خۆشەویستی هەیە بۆی، نە ئامادەیە کەس بە بچووکترین تانەوە ناوی ببات و باسی بکات، نە ئامادەیە هیچ ئافرەتێکی تر وەك ئەو تەماشا بکات، بە ناوهێنانی خێرا چاکەکانی خەدیجەی باس دەکرد، بە هاتنی کەس و دۆستانی خەدیجە دڵی دەگەشایەوە، کە دیاری و خێر و قوربانیەکیشی هەبوایە پشکی خۆشەویستانی خەدیجەی لەبیر نەدەکرد.

پێغەمبەر (ﷺ) تا دوای وەفاتی خەدیجە هیچ هاوسەرگیریەکی تری نەکرد، جا ئەمە لە سەرچاوەکاندا زۆر باسکراوەو وەك فەزڵێك بۆ دایکمان خەدیجە باس کراوە، لە راستیدا ئێمە نازانین ئایا پێغەمبەر (ﷺ) تایبەت لەبەر خەدیجە ئەوەی کردووە یان نا، بەڵام دەزانین پێغەمبەر (ﷺ) لەو ماوەی خەدیجەی هەبوو و پێغەمبەری خواش (ﷺ) بوو لەوپەڕی نارەحەتیدا بوو، لە مەککە بوو کە قۆناغی ئازار و سزادانەکان بوو، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دوای خەدیجە عائیشەی بەهاوسەرگرت کە زۆر زۆر لای خۆشەویست بوو و کچی هاوەڵی هەرە خۆشەویستیشی بوو، بەڵام ئەوە نەبوویە رێگر لەوەی هاوسەرگیری تر بکات و ئافرەتانی تریشی بەهاوسەر گرت، بەڵام ئەوەی لە دەقەکاندا بەدیدەکەین پێغەمبەر (ﷺ) خەدیجەی لە هەر هەموو ژنکانی تری خۆشتر ویستووەو ئەوەشی نەشاردوەتەوە.

## عائیشەی کچی ئەبووبەکر (رضي الله عنها)

ناوی عائیشەی کچی ئەبووبەکری صدیقە، باوکی یەکێکە لە نزیکترین هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و موژدەپێدراوی بەهەشت و یەکەم خەلیفەی موسڵمانان.

دایکی ناوی ئوممورومانی کچی عامیرە.

عائیشە زاناترینی نێو ئافرەتانی ئوممەتی ئیسلامە.[٨١٢٥]

## خوشك و براکانی

برایەکی ناوی عەبدولا بوو، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبووبەکر کۆچیان کرد بەرەو مەدینە، عەبدولا دەچوو هەواڵی قورەیشیەکانی دەبرد بۆیان، ئەوکات گەنجێك بوو، دواتر عەبدولا لە غەزاکاندا بەشداری کرد و لە هەریەك لە غەزاکانی فەتحی مەککەو حونەین و طائیفدا بەشداری کرد و برینداریش بوو، ئەو برینەی مایەوە تا لە سەردەمی خیلافەتی باوکیدا لە مانگی شەووالی ساڵی یانزەی کۆچیدا وەفاتی کرد.[٨١٢٦]

برایەکی تری ناوی عەبدوڕەحمان بوو، ئەمیش هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بوو و موحەممەدی کوڕیشی هاوەڵ بوو، عەبدوڕەحمان بەشداری بەدرو ئوحودی کرد بە بێباوەڕی، دواتر لە حودەیبیەدا موسڵمان بوو، لە سەردەمی خیلافەتی باوکیدا بەشداری جەنگی یەمامەی کرد و حەوت گەورە سەرکردەی بێباوەڕانی کوشت، پاشان بەشداری فتووحات بوو، لە جەنگی جەمەلدا هاوشانی عائیشەی خوشکی بەشدار بوو، دواجار لە ساڵی پەنجاو سێ دا کۆچی دوایی کرد.[٨١٢٧]

برایەکی تری ناوی موحەممەد بوو، ئەم منداڵەی لە حەجی ماڵئاواییدا لەدایك بوو، دواتر موحەممەد یەکێك بوو لە هێرشبەرانی سەر خەلیفە عوثمانی کوڕی عەففان، دواتریش کە میصری گرتە دەست لەگەڵ عەمری کوڕی عاص جەنگا و سوپاکەی موحەممەد شکا و دواتر کوژرا و سووتێنرا.[٨١٢٨]

---

٨١٢٥ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٣٥.

٨١٢٦ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٢٧-٢٨.

٨١٢٧ - أسد الغابة، ج٣، ص ٤٨١-٤٨٣.

٨١٢٨ - أسد الغابة، ج٥، ص ١٠٦.

خوشکێکی ناوی ئەسماء بوو، هەر زۆر زوو لە مەککە موسڵمان بوو و هاوسەری زوبەیری کوڕی عەووام بوو، کۆچی کرد بۆ مەدینەو سکی هەبوو بە عەبدوڵای کوڕی زوبەیرەوە، بە خاوەن دوو پشتێنەکە ناسراوە، تەمەنێکی زۆری کرد تا لە سەردەمی ئومەویدا دەسەڵاتی عەبدوڵای لە حیجاز بینی و مەرگی عەبدوڵای کوڕی بینی و پاش ماوەیەکی زۆر کەم لەو رووداوە وەفاتی کرد،[8129] لە پیتی (أ) دا باسی ژیانەکەیمان کردووە.

خوشکێکی تری ناوی ئومموکلثوم بوو، ئەبووبەکری باوکی لە سەرەمەرگدا بوو کە حەبیبەی کچی خاریجە سکی هەبوو بەو کچەیەوە.[8130]

## لەدایکبوونی:

لەدایکبوونی عائیشە راجیایی لەسەرە، چونکە ئەمەش بەستراوەتەوە بە مەسەلەی تەمەنی لەکاتی هاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ).

عائیشە دەڵێت هێشتا هۆشم نەکردبوویەوە کە باوك و دایکم باوەڕدار بوون، چی رۆژێکیش دەهات پێغەمبەر (ﷺ) بەیانی و ئێوارە دەهات بۆ لامان.[8131]

ذەهەبی دەڵێت عائیشە لە دوای هاتنی ئیسلام لەدایك بوو و تەمەنی هەشت ساڵ بچووکتر بوو لە فاطیمە.[8132]

## هاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)

دوای وەفاتی خەدیجە پێغەمبەر (ﷺ) سەودەی بە هاوسەر گرت و ماوەیەك تەنها سەودە خێزانی بوو، هەندێ دەق هاتووە کە نزیکەی سێ ساڵ تەنها سەودە هاوسەری بوو، ئینجا عائیشەی بەهاوسەرگرت.[8133]

---

٨١٢٩ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٨٧.
٨١٣٠ - أسد الغابة، ج٢، ص ١٠٥.
٨١٣١ - صحيح البخاري، الرقم ٤٦٦.
٨١٣٢ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٣٩.
٨١٣٣ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٦٥.

سەودە تەمەنی زۆر بوو، دەترسا پێغەمبەر (ﷺ) تەلاقی بدات،[8134] داوای کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) تەلاقی نەدات، هەروەها ئەو رۆژەی خۆی کە ماف بوو پێغەمبەر (ﷺ) بچێتەوە بۆ لای، بەخشی بە عائیشە.[8135]

هاوسەرگیری پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ عائیشە پێش کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بوو بۆ مەدینە، نزیکەی ساڵ و نیوێك یان دوو ساڵ پێش هیجرەت بوو کە عائیشەی مارە کرد، دواتر لە مانگی شەووالی ساڵی دووەمی کۆچی و پاش گەڕانەوەی لە غەزای بەدر ئینجا گواستیەوە.[8136]

کاتێك خەدیجە وەفاتی کرد، خەولەی کچی حەکیم وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوسەرگیری ناکەیت؟ ئەویش فەرمووی کێ بە هاوسەر بگرم؟ خەولە وتی کچت ئەوێت یان بێوەژن؟ فەرمووی ئەگەر کچ بێ کێ؟ خەولە وتی کچی خۆشەویستترین دروستکراوی خوا لەلات، عائیشەی کچی ئەبووبەکر؟ فەرمووی ئەی ئەگەر بێوەژن بێ کێ؟ وتی سەودەی کچی زەمعە، بڕوای پێ هێناویت و شوێن فەرمایشتت کەوتووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دەی بڕۆ و داوایان بکە بۆم، خەولە چوو بۆ ماڵی ئەبووبەکر و وتی ئەی ئوممورومان خوای گەورە چ خێر و بەرەکەتێکی بۆ دابارندوون؟ ئەویش وتی چیە؟ خەولە وتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی ناردووە بۆ داوای عائیشە، ئەویش وتی چاوەڕێ بکە تا ئەبووبەکر دێتەوە، ئەبووبەکر هاتەوەو خەولە پێی وت کە بۆچی هاتووە؟ ئەبووبەکر وتی جا بۆی گونجاوە لەکاتێدا عائیشە برازایەتی–برای ئایینی–؟! خەولە چوویەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و مەسەلەکەی بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی (بگەڕێرەوە بۆ لای و ئەم قسەی منی پێ بڵێ، من برای تۆ م وتۆیش برای منیت لە ئیسلامدا، کچەکەشت گونجاوە بۆ من)، خەولەش گەڕایەوەو پەیامی پێغەمبەری خوای(ﷺ) پێگەیاند، ئەبووبەکر وتی چاوەڕێ بکە، چونکە موطعیمي کوڕی عەددی داوای عائیشەی کردبوو بۆ کوڕەکەی، ئەبووبەکر چوو بۆ لای موطعیم، کەچی خۆیشی و ژنەکەشی تانەیان لێدا لەسەر موسڵمانبوونی، بەوە ئەبووبەکر یەکلا بوویەوە، ئەبووبەکر بە خەولەی وت پێغەمبەری خوام (ﷺ) بۆ

٨١٣٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٥٣.

٨١٣٥ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٧٣.

٨١٣٦ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٣٥.

بانگ بکە، ئەویش چوو پێغەمبەری خوای(ﷺ) بانگ کرد و ئەبووبەکر عائیشەی لە پێغەمبەر (ﷺ) مارە کرد، ئەوکاتیش تەمەنی شەش ساڵان بوو.[8137]

سەبارەت بە تەمەنی عائیشە لە کاتی مارەکردن و گواستنەوەیدا قسەو باسێکی زۆر هەیەو کراویشە بە گومانێك بەرامبەر بە ئیسلام، چونکە رایەك دەڵێت تەمەنی نۆساڵ بووە پێغەمبەر (ﷺ) گواستوویەتیەوە.[8138]

عائیشە دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) کە منی بە هاوسەر گرت تەمەنم شەش ساڵان بوو،... کاتێکیش پێغەمبەر (ﷺ) منی گواستەوە تەمەنم نۆ ساڵان بوو،[8139] کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) منی گواستەوە کەلوپەلی یاریەکانیشم لەگەڵ خۆم برد، کاتێکیش پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد تەمەنم هەژدە ساڵان بوو.[8140]

هەر لە گێڕانەوەی تردا هاتووە کە عائیشە لە حەوت ساڵیدا مارە کراوە.[8141]

عائیشە دەڵێت کاتێك کۆچمان کرد بۆ مەدینەو لە تەمەنی نۆ ساڵیدا بووم، لەناو هاوڕێکانمدا بووم، دایکم هاواری لێکردم و منیش چووم و نەمزانی بۆچی بانگم دەکات، دەستی گرتم و منی بردە بەردەرگا و لەوێ بردمیە ماڵەوە، بڕێك ئافرەتی پشتیوانان دانیشتبوون، وتیان لەسەر خێر و بەرەکەت و بەختی باش بێت، دایکم منی دایە دەست ئەوان، ئەوانیش سەریان شۆردم و منیان رازاندەوەو تەسلیمی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) کردم.[8142]

لە رووداوی ئیفکدا کە لە ساڵی پێنجەمی کۆچیدا روویدا، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری کرد لە بەریرە بزانێت رای چیە، بەریرە وتی: عائیشە ئافرەتێکە تەمەنی کەمە، کە لە لای هەویر دەشێلم بە دیاریەوە خەوی لێدەکەوێت و باڵندەو پەلەوەر دێن هەویرەکە دەخۆن.[8143]

---

٨١٣٧ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥١٩٨، سنه شعيب الأرناؤوط.

٨١٣٨ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٣٥.

٨١٣٩ - صحيح البخاري، الرقم ٣٧٠٣، صحيح مسلم، الرقم ٢٦٢٥.

٨١٤٠ - صحيح مسلم، الرقم ٢٦٢٧.

٨١٤١ - صحيح مسلم، الرقم ٢٦٢٧.

٨١٤٢ - صحيح مسلم، الرقم ٢٦٢٥، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٠٦، سنن أبي داود، الرقم ٤٣٠٧، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٤٧٧٠.

٨١٤٣ - صحيح البخاري، الرقم ٢٥١٥.

عائیشه دەڵێت من لای پێغەمبەر (ﷺ) بووم برێ کچی هاوڕێم هەبوون دەهاتن بۆ لام یارییان دەکرد لەگەڵم، کە پێغەمبەر (ﷺ) دەهاتەوە ئەوان لە شەرمدا خۆیان دەشاردەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) یەك یەك ئەوانی دەناردەوە بۆ لام تا یاریم لەگەڵ بکەن.[٨١٤٤]

لە هەموو ئەو گێڕانەوانەی پێشووەوە دەردەکەوێت کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی بەهاوسەر گرتووە تەمەنی عائیشە کەم بووە، چونکە هەموو فەرموودەکان صەحیحن و لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتون.

## کۆچی عائیشه بۆ مەدینە

عائیشەو کچەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) کۆچیان کرد بۆ مەدینە، عائیشه دەڵێت دوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، زەیدی کوڕی حارثەی نارد بۆ لامان و ئەبوورافیعی مەولاشی لەگەڵدا نارد، دوو وشتر و پێنج سەد درهەمی پێدان تا بۆ کۆچەکە چی وشتریان پێویستە بیکڕن، ئەبووبەکریش عەبدوڵای کوڕی ئورەیقیطی بە دوو یان سێ وشترەوە نارد و نامەیەکی نووسی بۆ عەبدوڵای کوڕی ئەبووبەکر و فەرمانی پێدەکرد دایکی و من و ئەسمائی خوشکم بەودا بنێرێت بۆ مەدینە، ئەوەبوو کەوتنەڕێ، لەنیوەی ڕێدا زەید بە پارەکە سێ وشتری کڕی، دواتر هەموویان هاتنە مەککەو ڕێیان کەوتە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا کە دەیویست خێزانی ئەبووبەکر ببات بۆ مەدینە، ئەوەبوو هەموومان کەوتینەڕێ، زەید و ئەبوورافیع فاطیمە و ئوممو کلثوم و سەودەی کچی زەمعەیان هێنان، هەروەها زەید ئوممو ئەیمەن و ئوسامەی کوڕی زەیدی هێنا، عەبدوڵای کوڕی ئەبووبەکریش دایکم و من و ئەسمائی هێنا، طەلحەش هاودەم بە ئێمە هات و هەموو پێکەوە کەوتینەڕێ تا گەیشتینە مەدینە، ئەو کات موسڵمانان خەریکی دروستکردنی مزگەوتی مەدینە بوون.[٨١٤٥]

عائیشه دەڵێت کە هاتینە مەدینە ماوەی مانگێك تووشی نەخۆشی و ئازارێکی زۆر بووم.[٨١٤٦]

---

[٨١٤٤] - صحيح البخاري، الرقم ٥٧٨٤، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٧٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٥٩٤٤، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٦٧١.

[٨١٤٥] - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٧٥٥.

[٨١٤٦] - صحيح مسلم، الرقم ٢٦٢٥.

# ڕووداوی ئیفك

ڕووداوی ئیفك لە غەزای مورەیسیعدا لە ساڵی پێنجەمی کۆچیدا ڕوویدا، ئەوکات عائیشە تەمەنی دوانزە ساڵان بوو.[٨١٤٧]

پێغەمبەر (ﷺ) هەرکات بیویستایە لە مەدینە دەربچێت تیروپشکی دەکرد بۆ هاوسەرەکانی و یەکێك لە هاوسەرەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد، لە غەزای مورەیسیعدا عائیشە ناوی دەرچوو.[٨١٤٨]

عائیشە خۆی وردەکاری ڕووداوەکە باس دەکات و دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرکات بیویستایە دەربچێت تیروپشکی دەکرد بۆ هاوسەرەکانی و یەکێك لە هاوسەرەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد، ئەوەبوو لە غەزایەکدا ناوی من دەرچوو، ئەمەش دوای دابەزینی ئایەتی حیجاب بوو، منیش لەناو کەژاوەیەکدا بووم، کە پێغەمبەر (ﷺ) لە غەزاکە بوویەوەو بەرەو مەدینە کەوتەوەڕێ، کە لە مەدینە نزیك بووینەوە، پاش حەوانەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دەرچوونی دەرکرد، منیش بە پیادە کەمێك لە سوپاکە دوورکەوتبوومەوە بۆ پێویستیەکم، کە تەواو بووم هاتمەوە بەرەو لای کاروانەکە، دەستم دا لە سنگم دەبینم گەردەنبەندەکەم پچڕاوە، بۆیە گەڕامەوە بۆی، ئەوە دوای خستم، تا هاتمەوە ئەوانەی کەژاوەکەی منیان هەڵگرتبوو کەژاوەکەیان خستبوویە سەر وشترەکەو وایانزانیبوو من تیایدام، ئەوکات ئافرەتان کێشیان کەم بوو و قەڵەو و قورس نەبوون، چونکە تەنها بەشی نەمانی برسێتی نانیان دەخوارد، بۆیە سووکی کەژاوەکەیان لا نامۆ نەبووبوو، کەوتبوونەڕێ، کە گەردنبەندەکەم دۆزیەوە گەڕامەوە، دەبینم کەس لەوێ نیە، چوومەوە هەمان شوێن کە تیایدا بووم و وتم دەگەڕێن بە دوامدا و دێنەوە بە شوێنمدا، دانیشتم تا ئەوەی خەو زۆری هێنا بۆ چاوەکانم و خەوم لێکەوت، صەفوانی کوڕی موعەططەلی سولەمی  لە دوای سوپاکەوە بوو، کە گەیشتە لای من، تارمایی کەسێکی خەوتووی بینی، هات بۆ لام، ئەو پێش دابەزینی ئایەتی حیجاب منی دیبوو، کە وشترەکەی مۆڵ دا بێدار بوومەوە، صەفوان دەستی دانا تا قاچ بخەمە سەری و سەر وشترەکە کەوتم، ئیتر منی بردەوە تا گەیشتینەوە لای کاروانەکە، ئەوان لە قرچەی نیوەڕۆدا لایاندابوو کە ئێمە گەیشتینە لایان، یەکەم کەس بەزمی بوهتانەکەی نایەوە عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول بوو، کە چووینەوە مەدینە ماوەی یەك مانگ من بەو دەردەوە –بوهتان بۆ کردن– مامەوەو باسی ئەو ڕووداوە بنێشتە خۆشەی دەمی ئەوانە بوو کە

---

[٨١٤٧] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٥٣.

[٨١٤٨] - صحيح البخاري، الرقم ٢٥٣٩، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٠٨.

بڕوایان وابوو تووشی تاوان بوم، ئەوەی زیاتر منی دەترساند، ئەوەبوو ئەو نەرمونیانەی پێشتر لە پێغەمبەر (ﷺ) دەمدی لەو ماوەدا لێم نەدەبینی، دەهاتەوە ماڵەوەو سەلامی دەکرد و دواتر دەیفەرموو (ئافرەتەکە چۆنە؟) منیش هیچم نەدەزانی تا لەو نەخۆشیەی تووشم بووبوو چاك بوومەوە، ئەوکات لەگەڵ ئوممومیسطەح دەرچووین بۆ دەست بەئاو گەیاندن کە تەنها بە شەویش دەردەچووین، ئەوکات هێشتا لەپاڵ ماڵدا سەرئاو نەبوو، دەچووین بە رێدا کە پێی گیر بوو لە جلەکەی، وتی لەناوچێت میسطەح، وتم خراپت وت قسە بە بەشداربوویەکی بەدر دەڵێیت؟ ئەویش وتی هۆو خاتوون مەگەر گوێت لە قسەی ئەو خەڵکە نەبووە؟ ئینجا قسەو باسەکەی بۆ گێڕامەوە، ئیتر هێندەی تر نەخۆش کەوتم، کە گەڕامەوە ماڵەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە ماڵەوەو سەلامی کرد و فەرمووی (ئافرەتەکە چۆنە؟)، وتم مۆڵەتم بدە بچمەوە بۆ لای دایك و باوکم، چونکە دەمویست بچمەوە بۆ لایان و دڵنیا بم لەوەی بیستوومە، پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتی دام و منیش چوومەوە ماڵەوەو بە دایکم وت ئەو خەڵکە چی دەڵێت؟ ئەویش وتی کچە شیرینەکەم باری خۆت قورس مەکە، بەخوا هەر ئافرەتێکی جوان لای پیاوێ بێت کە خۆشی بوێت و ئافرەتەکە هەوێی زۆری هەبێت، هەر هێرشی دەکەنە سەر، منیش وتم سوبحانەڵا، خەڵکی وا دەڵێن؟! ئیتر ئەو شەوە تا بەیانی فرمێسك لە چاوانم نەوەستا و خەو نەچووە چاوم، بۆ بەیانی پێغەمبەر (ﷺ) عەلی کوڕی ئەبووطالیب و ئوسامەی کوڕی زەیدی بانگ کرد و رای ئەوانی وەرگرت، چونکە هێشتا سروش لەو بارەوە دانەبەزیبوو، رای ئەوانی وەرگرت ئایا لە من جیابێتەوە یان نا؟ ئوسامە وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە خێزانتە و بەخوا تەنها خێر و چاکەی لە بارەوە دەزانین، عەلیش وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوا بارت تەنگ و سەخت ناکات و ئافرەتی تریش جگە لەو زۆرن، پرسیاریش بکە لە خزمەتکارەکە ئەو وەڵامی راستت پێ دەدات، پێغەمبەر (ﷺ) بەریرەی بانگ کرد، فەرمووی (ئەی بەریرە ئایا هیچت لە عائیشە دیوە کە جێی گومانت بێت؟) بەیرە وتی سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە تاکە شتێك لەم ئافرەتە دیومە ئەوەیە کە تەمەنی زۆر کەمەو کە هەویر دەشێلرێت بە دەم هەویرەکەوە خەوی لێدەکەوێت، پەلەوەر دێت و هەویرەکە دەخوات، پێغەمبەر (ﷺ) هەر ئەو رۆژە هەستا و لەنێو هاوەڵانیدا فەرمووی(من يعذرني من رجل بلغني أذاه في أهلي، فوالله ما علمت على أهلي إلا خيرا، وقد ذكروا رجلا ما علمت عليه إلا خيرا، وما كان يدخل على أهلي إلا معي)، (کێ پۆزشم بۆ وەردەگرێ لە کەسێ کە پێم گەیشتووە بە خراپە باسی خێزانەکەمی کردووە، دەی سوێند بەخوا من هەر چاکەی خێزانەکەم دەزانم–واتە چاکەم لێ دیوە– ئەوانە باسی پیاوێکیان کردووە کە بەس خێرو چاکەی لە بارەوە دەزانم، بەتەنها لەگەڵ خۆیشمدا

هاتووه بۆ لای خێزانەکانم)، سەعدی کوڕی موعاذ هەستاو وتی ئەی پێغەمبەری خوا بەخوا من ئەوەت بۆ دەکەم، ئەگەر لە ئەوسیەکان بێت دەدەین لە ملی، ئەگەریش لەناو برا خەزرەجیەکانماندا بێت فەرمانمان پێبکەیت فەرمانت بەجێدەگەیەنین، سەعدی کوڕی عوبادە کە گەورەی خەزرەجیەکان بوو و پیاوێکی چاك بوو بەڵام دەمارگیری گرتی، هەستاو وتی سوێند بەخوا درۆ دەکەیت نایکوژیتو ئەوەشت پێ ناکرێت، ئوسەیدی کوڕی حوضەیریش هەستاو وتی سوێند بەخوا درۆ دەکەیت، ئێمە دەیکوژین، تۆ دووڕوویت و سەبارەت بە دووڕوان مشتومڕ دەکەیت، هەردوو دەستەی ئەوس و خەزرەج هەستانو خەریکبوو بکەونە وێزەی یەکتر، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) کە لەسەر مینبەر بوو دابەزیو هێوری کردنەوە تا بێدەنگ بوون، پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو و منیش ئەو ڕۆژە هەر دەگریام، بۆ بەیانی دایك و باوکم هاتن بۆ لام، لە کەنارمەوە دانیشتبوون کە من دەگریام، لەو کاتەدا ئافرەتێکی پشتیوانان داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی کرد، منیش مۆڵەتم دا، ئەویش هات دانیشت و لەگەڵم دەستی کرد بە گریان، لەو حاڵەدا بووین کە پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ژوورەوەو لە دوور منەوە دانیشت، چونکە لەو ڕۆژەوەی ئەو قسانە کرابوو لە کەنار منەوە دانەدەنیشت، ماوەی مانگێك بوو خوا سروشی دانەبەزاندبوو، پێغەمبەر (ﷺ) شایەتومانی فەرموو و دواتر فەرمووی (يا عائشة، فإنه بلغني عنك كذا وكذا، فإن كنت بريئة فسيبرئك الله، وإن كنت ألممت بذنب، فاستغفري الله وتوبي إليه، فإن العبد إذا اعترف بذنبه ثم تاب تاب الله عليه)، (ئەی عائیشە ئاواو ئاوام لەبارەتەوە بیستووە، ئەگەر پاکیت ئەوە خوا پاکیت دەسەلمێنێت، ئەگەریش تووشی تاوانێك بویت ئەوەی داوای لێخۆشبوون لە خوا بکەو تەوبە بکە، چونکە بەندە ئەگەر دانی نا بە تاوانیدا و دواتر تەوبەی کرد ئەوە خوا لێی خۆش دەبێت)، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمایشتەکەی تەواو بوو فرمێسك لە چاوانم بڕا، بە باوکم وت تۆ لە بری من وەڵامی پێغەمبەر (ﷺ) بدەرەوە، ئەویش وتی بەخوا نازانم چی بە پێغەمبەر (ﷺ) بڵێم، وتم دەی دایکە تۆ لە بری من وەڵام بدەرەوە، ئەویش هەمان شتی وت، وتم بەخوا دەزانم ئێوە قسەی ئەو خەڵکەتان بیستووە و بڕواتان بە قسەی ئەوان کردووە، ئەگەر پێتان بڵێم من پاکم بڕوام پێ ناکەن، خواش خۆی دەزانێت من بێتاوانم، ئەگەریش بڵێم شتی وامکردووە بڕوام پێدەکەن لەکاتێکدا خوا دەزانێت من شتی وام نەکردووە، نموونەی من و ئێوە هەروەك بەسەرهاتەکەی باوکی یووسفە کە فەرمووی(فصبر جميل والله المستعان على ما تصفون)، ئینجا چووم بۆ ناو جێگەکەم و دەپارامەوە خوا پاکیم نیشان بدات، بەڵام بەخوا هەرگیز گومانیشم نەدەبرد کە لە بارەمەوە سروش دابەزێت، خۆم زۆر بە کەمتر لەوە دەزانی قورئان لە بارەمەوە بدوێت، بەڵام هیوام وابوو پێغەمبەر (ﷺ) خەوێك ببینێت کە تیایدا خوا پاکی من بسەلمێنێت، بەخوا کەس لەو کۆڕە

**نەچوویە دەرەوە تا سروش دابەزی بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، ئەو باری نارەحەتیەی لە سروشدا تووشی دەبوو تووشی بوو، لەو رۆژە باراناویەدا عارەقەی نێوچاوانی دەتوت مرواریە، کە پێغەمبەر (ﷺ) قورسی سروشی لەسەر لاچوو، پێدەکەنی، یەکەم قسە بە منی فەرموو (ئەی عائیشە سوپاسی خوا بکە، خوا پاکی تۆی سەلماند)، دایکم وتی هەستە وەرە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، وتم نابەخوا ناچم بۆ لای و تەنها سوپاسی خوا دەکەم، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە(إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١١﴾ لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ ﴿١٢﴾ لَّوۡلَا جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ ﴿١٥﴾ وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ قُلۡتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾)، کە خوا لە بارەی منەوە ئەو ئایەتانەی دابەزاند، ئەبووبەکر کە پێشتر بە پارە یارمەتی میسطەحی کوڕی ئەثاثەی دەدا، وتی بەخوا ئیتر لەمەودوا تا ماوم هیچ یارمەتی نادەم مادەم سەبارەت بە عائیشە وای دەوت، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە( وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾)، ئەبووبەکر وتی بەڵێ خوایە من ئەوەم پێ خۆشترە لێم خۆش بیت، بۆیە دەستی کردەوە بە یارمەتیدانی میسطەح.**[٨١٤٩]

**کاتێك رووداوی ئیفك روویدا، زەینەبی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) شایەتی خێری دا بۆ عائیشە، عائیشە دەڵێت لەناو خێزانەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) زەینەبی کچی جەحش رکەبەرم بوو، کە پێغەمبەر**

[٨١٤٩] - صحيح البخاري، الرقم ٢٥٣٩، صحيح مسلم، الرقم ٥٠٨٠، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٠٨، سنن الترمذي، الرقم ٣١٨٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٦٥٦، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٥٠٥١، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٩٠٣٨.

(ﷺ) سەبارەت بەو مەسەلەیە پرسیاری لێکرد زەینەب وتی بەخوا تەنها خێر دەزانم، ئەوەبوو خوا پاراستی لەو بوهتانە، بەڵام حەمنەی خوشکی لەبەر خوشکەکەی بەرامبەرم تێکەوت.[٨١٥٠]

حەسسانی شاعیری پێغەمبەر (ﷺ) یەکێك بوو لەو کەسانەی کە لە مەسەلەی ئیفکدا تێکەوت، مەسەلەی ئیفکیش ئەو بوختانە بوو کە کرا بۆ دایکی باوەڕداران عائیشە گوایە تووشی زینا بووە، چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر (ﷺ) بە هەڵە کەوتنە ژێر کاریگەری دووڕوان و کەوتنە ئەو هەڵەوە، ئەوانیش بریتی بوون لە حەسسانی کوڕی ثابتی شاعیری پێغەمبەر (ﷺ) و میسطەح و حەمنە، ئەوەبوو خوای گەورە لەو بارەوە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە:

(إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ)

(بێگومان کەسانێ کە ئەو بوهتانەیان (بۆ عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵبەست دەستەیە بوون لە خۆتان (با مونافیقیشیان تیا بوو) وا مەزانن ئەو (بوهتانە) شەڕ و خراپە بۆتان (وانیە) بەڵکو خێرو چاکەیە بۆتان بۆ هەریەك لەوانە هەیە لەتاوان بەو ئەندازەی هەوڵی داوە (لەو بوهتانەدا) وە ئەو کەسەیان کە بەشی گەورەی بوختانەکەی گرتە ئەستۆ (کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بوو) (لە ڕۆژی دواییدا) بۆ ئەوە سزای هەرە گەورە)،[٨١٥١] بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد هەشتا جەلد درا لەو سێ کەسە.[٨١٥٢]

لە ژیانی هەریەك لە حەسسانی کوڕی ثابت و حەمنەو میسطەحدا ڕوونکردنەوەی پێویستمان هێناوە سەبارەت بە هەڵوێستیان لە ڕووداوی ئیفکدا.

## چەند دیمەنێ لە ژیانی ئاسایی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)

طەخفە دەڵێت ئێمە لە مزگەوت ئەهلی صوففە بووین، پێغەمبەر (ﷺ) دوای نوێژی ئێوارە فەرمووی ئەی فلانە کەس تۆ لەگەڵ فلانە کەس بڕۆ، تۆش لەگەڵ فلانە کەس بڕۆ، بەو جۆرە تا هەمووی چوو و من پێنجەم کەس بووم مابوومەوە، فەرمووی لەگەڵ من وەرن، لەگەڵی چووینەوە بۆ

٨١٥٠ - صحيح مسلم، الرقم ٥٠٨٠.

٨١٥١ - مشكل الآثار للطحاوى، الرقم ٢٤٩٤

٨١٥٢ - مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٤٨٠٣، مشكل الآثار للطحاوى، الرقم ٢٤٩٤، تاريخ المدينة لابن شبة، الرقم ٦٣٤.

ماڵەوەو لە ماڵی عائیشە بوو، هێشتا ئایەتی حیجاب دانەبەزیبوو، فەرمووی ئەی عائیشە خواردنمان بۆ بهێنە، ئەویش نانێکی بۆ هێناین، دواتر هەمدی فەرمووی ئەی عائیشە خواردنمان بۆبهێنە، ئەویش خواردنی حەیسی–خورما و شیر و رۆن پێکەوە لێبنرێت– بۆ هێناین، هەمدی داوای خواردنی کرد و ئەویش قاپێ–شیری– بۆ هێناین، پێغەمبەر (ﷺ) لێی خواردەوەو دواتر فەرمووی ئەی عائیشە خواردنەوەمان بۆ بهێنە، ئەویش قاپێکی تر –شیری– هێنا، دواتر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێتان خۆشە لای ئێمە بمێننەوەو بخەون، حەزیش دەکەن بچن بۆ مزگەوت و لەوێ بخەون، ئیمەش چووین بۆ مزگەوت.[٨١٥٣]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: بەیانیەك پێغەمبەر (ﷺ) چوویە دەرەوەو جلێکی خوری لەبەر بوو کە لە مووی رەش دروستکرابوو، ئینجا حەسەنی کوڕی عەلی هات و پێغەمبەر (ﷺ) هێنایە ژوورەوە، دوای ماوەیەکی تر حوسەین هات و لەگەڵی هاتە ژوورەوە، دواتر فاطیمە هات و پێغەمبەر (ﷺ) ئەویشی هێنایەژوورەوە، ئینجا عەلیش هات و پێغەمبەر (ﷺ) ئەویشی هێنایە ژوورەوە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە(إنما يريد الله ليذهب عنكم الرجس أهل البيت و يطهركم تطهيرا).[٨١٥٤]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت جارێك ئەبووبەکر هاتە ژوورەوە بۆ لام و دوو کچۆڵەم لا بوون کە دەفیان لێدەدا، پێغەمبەریش (ﷺ) بە جلەکانی خۆی داپۆشیبوو، ئەبووبەکر هەڵشاخی پیایاندا، پێغەمبەر (ﷺ) جلەکانی لەسەر دەموچاوی لابرد و فەرمووی(دعهما يا أبابكر فإنها أيام عيد و تلك الأيام أيام منى)،[٨١٥٥] (وازیان لێ بێنە ئەی ئەبووبەکر، چونکە ئەم رۆژانە رۆژانی جەژنن و رۆژانی مینان).

ئەنەس دەڵێت دراوسێیەکی پێغەمبەر (ﷺ) فارس بوو، شلەی –گۆشتاوی– زۆر بەتامی دروست دەکرد، جارێك ئامادەی کرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و هات بانگهێشتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (ئەمەش) مەبەستی عائیشە بوو کە لەگەڵیدا بوو، کابرا وتی نا تەنها خۆت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دەی نایەم، ئەوەبوو کابرا هەمدی هاتەوەو پێغەمبەری خوای(ﷺ)

---

٨١٥٣ - صحيح ابن حبان، الرقم ٥٦٢٧، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

٨١٥٤ - صحيح مسلم، الرقم ٤٥٥٤، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣١٤٦٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٢٦٦٢،

٨١٥٥ - صحيح البخاري، الرقم ٩٥٨ و اللفظ له، صحيح مسلم، الرقم ١٥٢٧ حتى أيام عيد.

بانگهێشتکردەوە، هەمان شت روویدایەوە، لە جاری سێیەمدا کابرا وتی باشە با ئەویش بێت، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) و عائیشە بە شانەخڕێ و گەمەکردنەوە چوون تا گەیشتنە ماڵی کابرای فارس.[٨١٥٦]

عائیشە دەڵێت جارێك لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) پێشبڕکێمان کرد، من لێم بردەوە، دوای ماوەیەك قەڵەو بووم، هەمدی پێشبڕکێمان کرد و پێغەمبەر (ﷺ) لێی بردمەوەو فەرمووی ئەمەیان بەوی تر.[٨١٥٧]

عائیشە دەڵێت جارێك لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەرچووین، کە گەیشتینە ناوچەی بەیداء گەردنبەندێکم پچڕا، پێغەمبەر (ﷺ) بۆی گەڕا و خەڵکیش بۆی گەڕان و هیچ ئاویشمان پێ نەبوو، خەڵکی هاتن بۆ لای ئەبووبەکر و وتیان نابینیت عائیشە چی کرد؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خەڵکەکەی سەرقاڵ کرد و هیچ ئاویشمان پێ نیە و نزیکیش نین لە ئاوەوە، ئەبووبەکر هات و بینی پێغەمبەر (ﷺ) سەری لەسەر رانم بوو خەوتبوو، وتی ئاوا پێغەمبەر (ﷺ) و خەڵکەکەت دواخست و هیچ ئاویش لێرە نیەو ئاویشمان پێ نیە؟ زۆر سەرکۆنەی کردمو بەدەستی تێیدەخوڕیم، تەنها لەبەرئەوە نەدەجووڵام کە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر رانم خەوتبوو، کە رۆژ بوویەوەو پێغەمبەر (ﷺ) هەستاو ئاو نەبوو، خوای گەورە ئایەتی تەیەمومی دابەزاند، خەڵکەکە تەیەمومیان کرد، ئوسەیدی کوڕی حوضەیر وتی ئەی بنەماڵەی ئەبووبەکر ئەمە یەکەمجارتان نیە ئاوا بەرەکیتان هەبێت، ئینجا ئەو وشترەی لەسەری بووم جووڵا، دەبینین گەردنبەندەکە لەژێر ئەودایە.[٨١٥٨]

عائیشە دەڵێت جارێك پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووم (إني لأعلم إذا كنت عني راضية، وإذا كنت علي غضبى)، (من دەزانم تۆ کەی لێم رازیت و کەی لێم تووڕەیت) منیش وتم چۆن دەزانیت؟ فەرمووی (أما إذا كنت عني راضية، فإنك تقولين لا ورب محمد، وإذا كنت علي غضبى قلت لا ورب إبراهيم)، (ئەگەر لێم رازی بیت دەڵێیت نا بە خوای موحەممەد، ئەگەریش لێم تووڕە بیت دەڵێیت نا بەخوای ئیبراهیم)، منیش وتم بەڵێ بەخوا وایە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ).[٨١٥٩]

---

٨١٥٦ - صحيح مسلم، الرقم ٣٨٩١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٠٠١.

٨١٥٧ - صحيح ابن حبان، الرقم ٤٧٦٤، سنن أبي داود، الرقم ٢٢٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٦٦٩، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥٧٠٤، صححه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٢٥٧٨.

٨١٥٨ - صحيح البخاري، الرقم ٣٣١، صحيح مسلم، الرقم ٥٧٦، صحيح ابن حبان، الرقم ١٣١٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٢٩٠، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٩٣٠، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٤٨٨٣، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٩٠٣٢.

٨١٥٩ - صحيح البخاري، الرقم ٤٩٣٣، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٧٣، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢١٩، مسندأحمد بن حنبل، الرقم ٢٣٧٦٠.

له حەجیماڵئاواییدا کە عائیشەش هاودەم بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوو و عەبدوڕەحمانی برای عائیشەش بەشدار بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە عەبدوڕەحمان تا عائیشە ببات تا عومرەکەی بکات و دواتر بگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ).[٨١٦٠]

عائیشە دەڵێت شەوێك دوای نوێژی عیشا لە پێغەمبەر (ﷺ) دواکەوتم، دواتر چوومەوە بۆ لای، فەرمووی لە کوێ بوویت؟ وتم گوێمان لە قورئانخوێندنی هاوەڵێکت دەگرت لە مزگەوت قورئانی دەخوێن، دەنگی وا خۆش و خوێندنی وا دروستم نەبیستبوو، پێغەمبەر (ﷺ) هەستا و منیش لەگەڵی هەستام، چوو گوێی لێگرت، دواتر لایکردەوە بە لای مندا و فەرمووی(ئەوە سالیمی مەولای ئەبووحوذەیفەیە، سوپاس بۆ خوا کە کەسی وای لە ئوممەتەکەمدا داناوە).[٨١٦١]

## غیرەی دایکانی باوەڕداران عائیشە

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت ئەو غیرەی بەرامبەر خەدیجە هەمبوو بەرامبەر هیچ کەسی تر هێندە نەمبوو، چونکە پێغەمبەر (ﷺ)زۆر باسی دەکرد.[٨١٦٢]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) کە گۆشتی دەنارد بۆ هاوڕێکانی خەدیجەو و هێندەش زۆر باسی خەدیجەی دەکرد وام لێدەهات دەموت ئەڵێیت هەر خەدیجە ژن بووە، پێغەمبەریش (ﷺ) دەیفەرموو ئەو ئاواو و ئاوا بوو و من لەو منداڵم هەبوو).[٨١٦٣]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت جارێك هالەی خوشکی خەدیجە هاتە بەردەرگا، کە پێغەمبەر (ﷺ) زانی هالەیە خێرا راپەڕی و فەرمووی(اللهم هاله) (ئای خوایە هالە هاتووە)، منیش غیرە دایگرتم و وتم چیە ئەوەنە باسی ئەو پیرەژنە قوڕەیشیە دەکەیت،[٨١٦٤] پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەوەی لێ بیستم دەموچاوی تووڕە هەڵگەڕا.[٨١٦٥]

---

٨١٦٠ - صحيح البخاري، الرقم ١٤٩٤.

٨١٦١ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٩٥٣، صححه الذهبي.

٨١٦٢ - صحيح البخاري، الرقم ٣٦٢٩.

٨١٦٣ - صحيح البخاري، الرقم ٣٦٣٠.

٨١٦٤ - صحيح البخاري، الرقم ٣٦٣٣.

٨١٦٥ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١١٨.

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت کاتێك ناوی خەدیجە دەبرا ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) زۆر وەسفی دەکرد و زۆر یادی دەکردەوە، منیش ڕۆژێك غیرەم هەبوو وتم چیە ئەوەنە باسی ئەو لاجانگ سوورە ئەکەیت خوا لە بری ئەو چاکتری پێ بەخشیویت، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی(ما أبدلني الله عز وجل خيرا منها، قد آمنت بي إذ كفر بي الناس، وصدقتني إذ كذبني الناس، وواستني بمالها إذ حرمني الناس، ورزقني الله عز وجل ولدها إذ حرمني أولاد النساء)،[٨١٦٦] (خوای گەورە لەو چاکتری پێ نەبەخشیوم، خەدیجە کاتێك باوەڕی پێ هێنام کە خەڵکی بڕوایان پێ نەدەهێنام، کاتێك خەڵکی بە درۆیان دەخستمەوە بەراستی زانیم، کاتێك خەڵك بێبەشیان دەکردم ئەو بە سامانەکەی دڵنەوایی و پاڵپشتی دەکردم، خوای گەورە لەو منداڵی پێ بەخشیم کەچی لە ژنەکانی ترم بێبەشی کردم لە منداڵ).

عائیشە و حەفصەی دایکانی باوەڕداران غیرەیەکیان هەبوو بەرامبەر بە هەڵوێستێك کە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ زەینەبی کچی جەحش هەیبوو، حەفصە دوای عائیشەو زەینەبیش دوای حەفصە بوون بە هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) کە دەچوو بۆ لای زەینەب لای ئەو هەنگوینی دەخوارد، عائیشەو حەفصەش بڕیاریاندا پێکەوە کارێك بکەن پێغەمبەر (ﷺ) ڕاگرن لەو خواردنی هەنگوینە، بۆیە بڕیاریان دا پێغەمبەر (ﷺ) بچێت بۆ لای هەرکامیان بڵێن ئەوە مەغافیرت خواردووە (خواردنێکی بۆن ناخۆشە)، ئەو بۆنەت لێ دێت، پێغەمبەریش (ﷺ) کە ئەوەی پێ وترا فەرمووی (نا، بەڵام من لای زەینەبی کچی جەحش هەنگوینم خواردووە، ئیتر هەرگیز نایخۆم و سوێندیشم خواردووە، هەواڵی ئەمەش مەڵێ بە کەس)،[٨١٦٧] ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ، قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ، وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَنْ بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنْبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ)،[٨١٦٨] (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆچی شتێك لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت

---

٨١٦٦ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٤٣٠٩، قال الذهبي في البداية والنهاية (ج٣، ص ١٢٨) إسناده لا بأس به، صححه شعيب الأرناؤوط.

٨١٦٧ - صحيح البخاري، الرقم ٤٦٣٠.

٨١٦٨ - صحيح مسلم، الرقم ٢٧٧٢.

تۆ ڕەزامەندی ژنەکانت دەویٚ لە کاتێکدا خوا لێخۆشبووی میهرەبانە، بێگومان خوا دایناوە بۆتان هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتان خوا کارساز و دۆستی ئێوەیە وە ئەو زانای کاردروستە، کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) بەنهێنی لای هەندیٚ لە ژنەکانی قسەیەکی درکاند ئینجا کە ئەو (ژنە) قسەکەی کرد (بۆ هەوێکەی) خواش پێغەمبەری (ﷺ) ئاگادار کرد (پێغەمبەر (ﷺ)) هەندێك (لە قسەکان) ی باسکرد و بیٚ دەنگ بوو لە هەندێکی تری ئینجا کە پێی وت (ژنەکەی) وتی: کیٚ ئەمەی پیٚ گەیاندی فەرمووی خوای زانای ئاگادار پێی گەیاندم، ئەی (حەفصە و عائیشە) ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خودا (جیٚ ی خۆیەتی) چونکە بەڕاستی دڵتان لایدا (لە حەق و ڕاستی) وە ئەگەر پشتی یەکتر بگرن لە دژی پێغەمبەر (ﷺ) (سەرکەوتوو نابن) چونکە بێگومان خوا پشگیری ئەوەو هەروەها جوبرەئیل و ئیمانداره چاکەکانیش دوای ئەوان فریشتەکانیش پشتیوانی ئەون).

لە گێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا هەمان بەسەرهات هاتووە، بەڵام وا هاتووە کە خاوەنی هەنگوینەکە حەفصە بووەو پلان دانانەکەش عائیشەو سەودە بون،[٨١٦٩] بەڵام ئیبن حەجەر لە شەرحی بوخاریدا دەڵێت دەگونجێت ئەو ڕووداوە جارێکی تر بووبێت و پەیوەست نەبووە بەم ڕووداوەو بە دابەزینی ئەم ئایەتانەوە، چونکە ڕووداوی هەنگوینەکەی زەینەب و پیٚ ناخۆش بوونی عائیشەو حەفصە چەسپاوە، لەو بارەشەوە مشتومڕێکی ورد دێنێت، ئەو پێی وایە کە لەوانەیە ڕووداوەکەی هەنگوین خواردن لای حەفصە پێش ئەم ڕووداوە بووبێت و پەیوەست نەبووبێت بەو ئایەتانەوە،[٨١٧٠] بەڵام ئەمە وردەکاری دەوێت، چونکە ناکرێت پێغەمبەر (ﷺ) دوو جار بە هەمان ڕووداو تێکەوتبێت، وەك خۆی لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت (لا يلدغ المؤمن من جحر واحد مرتين)،[٨١٧١] (باوەڕدار دوو جار لە کونێکدا ناگەزرێت)، ناگونجێت پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم جار بەو جۆرەی بەرامبەر کرابێت و بۆ جاری دووەمیش هەمان شتی بەرامبەر کرابێت و هەستی پیٚ نەکردبێت، دوور بێت لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ئەمە بە لاوازدانانی هەست و پێزانینی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، بۆیە دەکرێت ئەگەرێکی تر هەبێت، ئەویش ئەوەیە دەبێت پێغەمبەر (ﷺ) ئاگادار نەبووبێت بە ڕووداوی یەکەم و ئەو شتەی بۆ ئاشکرا نەبووبێت

---

٨١٦٩ - صحيح مسلم، الرقم ٢٧٧٣.

٨١٧٠ - فتح الباري، ج٩، ص ٣٧٦ - ٣٧٧.

٨١٧١ - صحيح البخاري، الرقم ٥٧٨٧، صحيح مسلم، الرقم ٥٤٢٧، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٦٤، سنن أبي داود، الرقم ٤٢٤١، سنن الدارمي، الرقم ٢٧٣١، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٨٧٢٥، المعجم الاوسط للطبراني، الرقم ٦٨٨٩.

تا له ڕووداوی دووەمدا ئینجا خوای گەورە ئاشکرای کردبێت، چونکە وەك هاتووە کاتێك هەریەك لە عائیشەو سەودە وا دەڵێن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەویش دەچێتەوە بۆ لای حەفصە، حەفصە دەڵێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو هەنگوینەت بۆ تێبکەم؟ ئەویش دەفەرموێت نا پێویستم نیە، ئینجا سەودە بە عائیشەی وت سوبحانەڵا، بەخوا ئەو هەنگوینەمان لێ حەرام کرد، عائیشەش بە سەودەی وت بێدەنگ بە،[8172] بۆیە نابینین هیچ سوێند خواردنێکی تێدا بووبێت بۆ نەخواردنی و باسی دابەزینی ئایەتەکەشی تێدا نیە.

بەهەرحاڵ ئەم ڕووداوە بەڵگەیە لەسەر بوونی غیرە لای ئافرەتان، وەك دەبینین ئوممو سەلەمەی دایکی باوەڕداران خۆی دان بەوەدا دەنێت و کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) داوای دەکات ئەو دەڵێت ئاخۆ من ئافرەتێکم غیرەیەکی زۆرم تێدا هەیە،[8173] هەروەها کاتێك پرسیار دەکرێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆچی ئافرەتێکی پشتیوانان بەهاوسەر ناگریت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێت (إن فيهم غيرة شديدة)،[8174] (ئەوان غیرەیەکی زۆر زۆریان تێدایە).

هەروەك ئەمە بەڵگەیەکی جوان و ڕوونە بۆ موسڵمان تا ئەگەر هەڵەیەکی لە هەر کەسێك بەدی کرد نەیکاتە بیانوو بۆ سفرکردنەوە یان شکاندنی ئەو کەسە، چونکە مرۆڤ هەرکات جێی هەڵەکردنەو دەکەوێتە هەڵەوە، دەبینین ئەوە هاوسەرانی پێغەمبەری خوان (ﷺ) و دایکانی باوەڕدارانن، کەچی دەکەونە هەڵەوەو تەوبەش دەکەن و خوای گەورەش نایانشکێنێتەوە، بەڵکو پێشنیازی تەوبەیان بۆ دەخاتەڕوو، پێغەمبەریش (ﷺ) هەڵوێستی قورسی نەگرتەبەر بەرامبەریان و کارەکەی جێهێشت بۆ فەرمانی خوا، کەچی دەبینین لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا موسڵمانانێك هەن چاو دادەخەن لە ئاست هەوڵ و ماندوێتی بانگەواز و جیهاد و ڕەنجی دەیان یان سەدان بانگخوازی ڕێی خوادا و بە بینینی هەڵەیەك لە هەر کەسێك لەوانە دەکەونە زەقکردنەوەی هەڵەکەی و شکاندنی و ئیدی بە کەم تەماشاکردنی، جا خۆ ئەگەر وا بوایە دەبوو ئەم ژنانەی پێغەمبەر (ﷺ) لەو ئاستە بەرزەیان داماڵرابان و دەرکرابان، بەڵام ئایا خوا و پێغەمبەر (ﷺ) بڕیار و خوێندنەوەیان بۆ باری مرۆیی وایە؟ نەخێر، خوا داناوە مرۆڤ هەڵە دەکات و تەوبەی لەسەر واجب دەبێت، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (كل بني آدم خطاء و خير

---

٨١٧٢ - صحيح مسلم، الرقم ٢٧٧٣.

٨١٧٣ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٦٠٢٤،

٨١٧٤ - المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٨٣٦٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥١٩٧، معجم أبي يعلى الموصلي، الرقم ١٦٠.

الخطائين التوابون)، (هەموو ئادەمیزاد هەڵەکارن و چاکترینی هەڵەکاران تەوبەکارانن)، تەنانەت خوای گەورە دایناوە هەر دەبێت مرۆڤ هەڵە بکات و تەوبەی لێ بکات، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە (والذي نفسي بيده لو لم تذنبوا لذهب الله بكم، ولجاء بقوم يذنبون فيستغفرون الله فيغفر لهم)،[٨١٧٥] (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئێوە تاوان نەکەن، بە دڵنیاییەوە خوای گەورە ئێوە لادەبات و خەڵکانێك دێنێت کە تاوان دەکەن و ئینجا داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەن و خوای گەورەش لێیان خۆش دەبێت).

## پلەوپایەی لای پێغەمبەر(ﷺ)

عەمری کوڕی عاص دەڵێت پرسیار کرا لە پێغەمبەر (ﷺ) کێ زۆر لات خۆشەویستە؟ فەرمووی عائیشە، وتیان ئەی لە پیاوان؟ فەرمووی ئەبووبەکر، وتیان دواتر، فەرمووی عومەر، وتیان دواتر، فەرمووی ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەڕاح.[٨١٧٦]

عائیشە دەڵێت جارێك پێغەمبەر (ﷺ) باسی گەورەیی فاطیمەی کرد، منیش قسەم کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی(ئایا بەوە ڕازی نیت هاوسەری دنیا و ئاخیرەتیشم بیت؟) وتم بەرێ وەڵا، فەرمووی(دەی تۆ هاوسەری دنیا و ئاخیرەتی منیت).[٨١٧٧]

هاوەڵان دەیانزانی پێغەمبەر (ﷺ) چەندە عائیشەی خۆشدەوێت، بۆیە هەرکات بیانویستبا دیاریەکی بۆ ببەن، دەوەستان تا بچێت بۆ ماڵی عائیشە ئینجا دیاریەکەیان بۆ دەبرد، جا دەستەیەك لە ژنانی پێغەمبەر (ﷺ) کە هاوڕای ئومموسەلەمە بوون، بە ئومموسەلەمەیان وت لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) قسە بکە تا بە خەڵکەکە بڵێت هەرکەس دەیەوێت دیاری ببات بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بۆی ببات با لە ماڵی هەر ژنێکی بێت، ئومموسەلەمەش چوو ئەوەی وت بە پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی نەدایەوە، جارێکی تر ژنەکانی تری ئومموسەلەمەیان بۆ هەمان مەبەست ناردەوەو پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی نەدایەوە، لە جاری سێیەمدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (لا تؤذيني في عائشة فإن الوحي

---

٨١٧٥ - صحيح مسلم، الرقم ٥٠٤٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٧٨٧٤.

٨١٧٦ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٠٨، صححه شعيب الأرناؤوط.

٨١٧٧ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٧٧١، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٠٤، صححه الذهبي في التلخيص، كما صححه شعيب الارناؤوط.

لم يأتني وأنا في ثوب امرأة إلا عائشة)،[8178] (سەبارەت بە عائیشە ئازارم مەدە، چونکە هیچ کات لەژێر یەك جل لەگەڵ ئافرەتێك بوویم سروشم بۆ نەهاتووە مەگەر لەگەڵ عائیشە).

جارێك هەندێ لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کۆبوونەوە تا ناڕەزایی دەربڕن بەرامبەر بەو خۆشەویستیە زۆرەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هەیبوو بۆ عائیشە، فاطیمەی کچی پێغەمبەریان (ﷺ) نارد بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و تیان پێی بڵێ بۆ خاتری خوا لە خۆشەویستی بۆ عائیشە دادپەروەر بێت، ئەویش چوو و ئەوەی بە پێغەمبەر (ﷺ) وت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کچە ئازیزەکەم ئایا ئەو ئافرەتەت خۆش ناوێت کە من خۆشم دەوێت؟) فاطیمە وتی با، گەڕایەوەو هەواڵەکەی دایەوە بە هاوسەرەکانی تری، ئینجا بڕیاریان دا زەینەبی کچی جەحش بنێرن، زەینەب چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتووڕە بوو و وتی ژنەکانت دەڵێن بۆ خاتری خوا بەرامبەر بە خۆشەویستیت بۆ عائیشە دادپەروەر بە، هێندە دەنگی بەرز کردەوە تا کار گەیشتە ئەوەی قسەیەکی وت بە عائیشە، عائیشەش لەولاوە دانیشتبوو، پێغەمبەر (ﷺ) تەماشایەکی عائیشەی کرد وەك پێی بفەرموێت قسەت نیە؟ عائیشەش کەوتە وەڵامدانەوەی زەینەب تا بێدەنگی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) تەماشایەکی عائیشەی کرد و فەرمووی: ئەوە کچی ئەبووبەکرە.[8179]

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی(فضل عائشة على النساء كفضل الثريد على سائر الطعام)،[8180] (فەزڵ و گەورەیی عائیشە بەسەر ژنانەوە وەك فەزڵی تریتی پڕ بە گۆشت وایە بەسەر هەموو خواردنەکاندا).

## فیتنە لە ماڵی عائیشەوە

ئیبن عومەر دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) وتاری دەداو ئاماژەی کرد بە ماڵی عائیشەو فەرمووی(هنا الفتنة–ثلاثا– من حيث يطلع قرن الشيطان)،[8181] (فیتنە لێرەوەیە، فیتنە لێرەوەیە، فیتنە لێرەوەیە، لێرەوە شاخی–یان هەوادارانی– شەیتان دەردەکەون).

---

[8178] - صحيح البخاري، الرقم ٢٤٦٢، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٩٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٦٢٤، قال الذهبي في سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٤٣ متفق على صحته.

٨١٧٩ - صحيح البخاري، الرقم ٢٤٦٢.

[8180] - صحيح البخاري، الرقم ٣٢٦٦، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٨٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٢٠، سنن الدارمي، الرقم ٢٠٤٢، سنن ابن ماجة، الرقم ٣٢٧٨، سنن الترمذي، الرقم ٣٩٠٤، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٦٢١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٣٤٥.

[8181] - صحيح البخاري، الرقم ٢٩٥٤.

جا نەیارانی عائیشە ئەوە دەکەن بە تانە کە عائیشە سەری فیتنەیە، بەڵام بە خوێندنەوەی فەرموودەکە کە لە دەقی تردا روونکراوەتەوە دەردەکەوێت مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) ماڵی عائیشە نەبووە، بەڵکو مەبەستی ئەو بەرەیە بووە کە بەری رۆژهەڵات دەکات.

ئیبن عومەر دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) رووی کردبوویە رۆژهەڵات و فەرمووی(بزانن فیتنە لێرەوەیە، بزانن فیتنە لێرەوەیە، بزانن فیتنە لێرەوەیە، لێرەوە کە شاخی شەیتان دەردەکەوێت).[8182]

لە گێڕانەوەیەکی تردا ئیبن عومەر دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی عائیشەوە هاتە دەرەوەو فەرمووی(فیتنە ئا ئەلێرەوەیە کە شاخی شەیتان دەردەکەوێت) مەبەستی رۆژهەڵات بوو.[8183]

جا رۆژهەڵاتەکەی رووەو بەحرەین بوو کە یەکەم فیتنە لەوێ بە دەرکەوتنی موسەیلەمەی درۆزن دەرکەوت.[8184]

## لە کاتی وەفاتی پێغەمبەردا(ﷺ)

عائیشە دەڵێت کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش کەوت و ئازاری زیادی کرد، مۆڵەتی لە هاوسەرەکانی تری خواست تا لە ماڵی من بمێنێتەوە، ئەوانیش رازی بوون، ئەوەبوو دوو کەس ئەملاولا، پێغەمبەری خوایان (ﷺ) گرت و ئەویش قاچەکانی بە زەویدا دەخشان، –ئەوانیش بریتی بوون لە عەبباس و عەلی کوڕی ئەبووطالیب–.[8185]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش کەوت دەیفەرموو (أين أنا غدا؟)، (سبەی لە ماڵی کام هاوسەرمم؟) چونکە حەزی دەکرد لە ماڵی عائیشە بێت، ئەوەبوو هاوسەرەکانی تری مۆڵەتیان دا تا کام ماڵی پێ خۆشە لەوێ بمێنێتەوە، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی عائیشە مایەوە تا وەفاتی کرد.[8186]

سالیم باسی ساتەکانی نەخۆشی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکات و دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش کەوت و لەهۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، فەرمووی ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ منیش وتم بەڵێ، فەرمووی بە بیلال بڵێن با بانگ بدات، بە ئەبووبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵك

---

[8182] – صحيح البخاري، الرقم ٦٦٩٧، صحيح مسلم، الرقم ٥٢٧٥.

[8183] – صحيح مسلم، الرقم ٥٢٧٨.

[8184] – صحيح ابن حبان، الرقم ٦٧٥٨.

٨١٨٥ – صحيح البخاري، الرقم ١٩٤.

[8186] – صحيح البخاري، الرقم ٤١٩٤.

بکات، هەمدی لە هۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، فەرمووی ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ منیش وتم بەڵێ، فەرمووی بە بیلال بڵێن با بانگ بدات، بە ئەبووبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی لەهۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، عائیشە وتی باوکم کەسێکی دڵناسکەو زوو گریان دایدەگرێت، بەڵکو کەسێکی تر بنێریت بۆ بەرنوێژی، پێغەمبەر (ﷺ) هەمدی فەرمووی ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ وتمان بەڵێ، فەرمووی بە بیلال بڵێن با بانگ بدات، بە ئەبووبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی عائیشە وتی باوکم کەسێکی دڵناسکەو زوو گریان دایدەگرێت، بەڵکو کەسێکی تر بنێریت بۆ بەرنوێژی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئێوەی ئافرەتان هاودەمە ژنەکانی یووسفن، بە بیلال بڵێن با بانگ بدات و بە ئەبوبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بکات بۆ خەڵك)، هەمدی لەخۆش خۆی چوو، بیلال بانگی دا و قامەتی کرد و ئەبووبەکریش چوو بەرنوێژی بکات بۆ خەڵکەکە، پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە هۆش خۆی و فەرمووی ئایا نوێژ دابەسراوە؟ وتم بەڵێ، فەرمووی (کەسێکم بۆ بانگ بکەن تا خۆمی پێوە بگرم)، ئەوەبوو بەریرەو کەسێکی تر هاتن و پێغەمبەر (ﷺ) باڵی دایە سەر شانیان و بەو حاڵەوە چوو بۆ نوێژ، لەپاڵ ئەبووبەکردا دانیشێنرا، ئەبووبەکر ویستی بگەڕێتە دواوە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەبووبەکری هێشتەوە تا نوێژەکە تەواو بوو.[٨١٨٧]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش بوو و لە ماڵی عائیشە بوو، عەبدوڕەحمان چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و سیواکی پێ بوو دەیهێنا بە دانیدا، پێغەمبەر (ﷺ) تەماشایەکی سیواکەکەی کرد، عائیشە سیواکەکەی لە عەبدوڕەحمان وەرگرت و پاکی ڕاگرت و دواتر دای بە پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) سیواکەکەی بەکارهێنا.[٨١٨٨]

عائیشە دەڵێت فاطیمە هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کە دەچوو بەڕێدا دەتوت هەمان ڕێکردنی پێغەمبەرە(ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی مەرحەبا لە کچەکەم، ئینجا لای خۆیەوە داینیشاند، دواتر چپەیەکی بۆ کرد و فاطیمە گریا، وتم بۆچی دەگریت؟ دواتر پێغەمبەر (ﷺ) چپەیەکی تری بۆ کرد و فاطیمە دەستی کرد بە پێکەنین، منیش وتم تا ئێستا نەمدیوە خەم و خۆشی ئاوا لەیەك نزیك بن، وتم چۆن بوو واگریایت و دواتر پێکەنیت؟ فاطیمەش وتی نهێنی پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکرا ناکەم، دواتر کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، چووم هەمان پرسیارم لێکردەوە، ئەویش وتی چپاندی بە گوێمدا

---

٨١٨٧ - صحيح ابن خزيمة، الرقم ١٥٢٧، سنن ابن ماجة، الرقم ١٢٣٠، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سن ابن ماجة، الرقم ١٢٣٤.

٨١٨٨ - صحيح البخاري، الرقم ٨٦٤.

(جیبریل هەموو ساڵێك یەك جار قورئانی لەگەڵ دەور دەكردمەوە، ئەمساڵ دوو جار لەگەڵم دەوری كردەوە، وادەزانم ئەمە ئاماژەی مەرگمە، تۆیش یەكەم كەسیت بە من دەگەیتەوە)، منیش دەستم كرد بە گریان، دواتر فەرمووی(ئایا رازی نابیت تۆ گەورەی ژنانی بەهەشت –یان گەورەی ژنانی باوەڕداران– بیت؟) منیش بەوە پێكەنیم.[8189]

عائیشە دەڵێت پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی كە لە سەرەمەرگیدا بوو، جامێك ئاوی لەلا بوو، دەستی دەكرد بە ناو ئاوەكەدا و دەموچاوی پێ دەسڕی و دەیفەرموو (اللهم أعنى على سكرات الموت)،[8190] (خوایە هاوكارم بە لەسەر ئازار و نارەحەتیەكانی مەرگ).

## لە خیلافەتی باوكیدا

دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەبووبەكری صدیق بوو بە خەلیفە و عائیشەش لەو ماوەدا لە مەدینە مایەوەو رێنمایی و زانستی پێشكەش بە موسڵمانان دەكرد.

عائیشە چوو بۆ لای فاطیمەی كچی پێغەمبەر (ﷺ) و وتی ئەریَ كاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە سەرەمەرگدا بوو، بینیم خۆت دا بەسەر پێغەمبەردا (ﷺ) و دواتر گریایت، ئینجا هەمدی خۆت دا بەسەریدا و پێكەنیت، ئەویش وتی لە یەكەمیاندا پێی وتم دەمرێت، منیش گریام، لە دووەمیاندا پێی وتم من لەناو كەسوكاریدا لە هەموان زووتر پێی دەگەمەوە و هەروەها من گەورەی ژنانی بەهەشتم جگە لە مەریەمی كچی عیمران، منیش پێكەنیم.[8191]

حەسەن دەڵێت كاتێك ئەبووبەكر لە سەرەمەرگدا بوو، بە عائیشەی وت ئەی عائیشە سەیری ئەو وشترە بكە كە لە شیرەكەیمان دەخواردەوەو ئەو تەشتەی بەكارمان دەهێنا و ئەو بەرگەی دەمانپۆشی، ئێمە كاتێك كاروباری موسڵمانانمان بەدەست بوو ئەو شتانەمان بەكاردەهێنا، جا ئەگەر مردم ئەوانە ببە

---

[8189] - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٤٦.

[8190] - سنن ابن ماجة، الرقم ١٦١٨، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٦٦٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٦٨٧٢، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٣٨٠٠، صححه الذهبي في التلخيص، ضعفه شعيب الأرناؤوط، كما ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٦٢٣.

[8191] - صحيح ابن حبان، الرقم ٧٠٦٢، حسنه شعيب الأرناؤوط.

بۆ عومەر، ئەوەبوو کە ئەبووبەکر مرد ئەو شتانەی نارد بۆ عومەر، ئەویش وتی خوا لێت رازی بێت ئەی ئەبووبەکر، ئەرکی ئەوەی دوای خۆتت سەخت کرد.[٨١٩٢]

## له خیلافەتی عومەردا

دوای وەفاتی ئەبووبەکر، عومەری کوڕی خەططاب بوو بە خەلیفەو عائیشە لەو سەردەمەشدا هەمان شێوەی پێشووتر سەرقاڵی بەخشینەوەی زانست بوو.

کاتێك عومەری کوڕی خەططاب مووچەی بۆ خەڵکی بڕیەوە، بۆ هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دە هەزاری بڕیەوە، بەڵام بۆ عائیشە دوانزە هەزاری بڕیەوە، چونکە دەیزانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی زیاتر خۆشدەویست.[٨١٩٣]

هەروەها کە عومەر بە دەستی ئەبوولوئلوئەی مەجووسی بریندار کرا، شەش کەسی دانا تا لەنێو خۆیاندا کەسێك بۆ خیلافەت هەڵبژێرن، ئینجا وتی بڕۆن مۆڵەت لە عائیشە وەربگرن و لە ماڵەکەی ئەودا راوێژەکەتان بکەن، ئەوانیش وایانکرد.[٨١٩٤]

کاتێك عومەری کوڕی خەططاب پێکرا، بە عەبدوڵای کوڕی وت بڕۆ بزانە کێ منی کوشت؟ ئەویش وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەبوولوئلوئەی کۆیلەی موغیرەی کوڕی شوعبە تۆی کوشت، عومەریش وتی سوپاس بۆ خوا کە مەرگی منی بە دەستی کەسێك نەهێنا کە تاکە سوجدەیەکیشی بردبێت بۆ خوا، ئەی عەبدوڵا بڕۆ بۆ لای عائیشەو پرسیاری لێ بکە بزانە مۆڵەت دەدات لەلای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبووبەکر ئەسپەردە بکرێم؟[٨١٩٥]

عەمری کوڕی مەیموون دەڵێت ئامادە بووم کاتێك عومەر بە عەبدوڵای کوڕی وت بڕۆ بۆ لای دایکی باوەڕداران عائیشەو بڵێ عومەر سەلامت لێ دەکات، دواتر پرسیاری لێ بکە بزانە مۆڵەت دەدات لای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبووبەکر ئەسپەردە بکرێم؟ عائیشەش وتی من ئەوەم بۆ خۆم دانابوو، بەڵام ئەمڕۆ لە خۆم دەگوزەرم بۆ عومەر، کە عەبدوڵا هاتەوە عومەر وتی چیت کرد؟ ئەویش وتی مۆڵەتی دا، عومەر

---

٨١٩٢ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣٦.

٨١٩٣ - الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٣٥١.

٨١٩٤ - الكامل في التاريخ، ج٢، ص ٤٦٠.

٨١٩٥ - الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٢، ص ٤٤٧.

وتی هیچ شتێ هێندەی ئەو شوێنە لام گرنگ نیە، جا کە مردم بمبەن بۆ ئەوێ و دواتر سەلام بکەن، دواتر هەمدی بلێ عومەری کوڕی خەططاب داوای مۆڵەت دەکات، ئەگەر عائیشە هەمدی مۆڵەتی دا ئەوکات ئەسپەردەم بکەن، ئەگەریش دەرفەتی نەدا بمگێڕنەوەو بمبەن بۆ گۆڕستانی موسڵمانان.[8196]

## له خیلافەتی عوثماندا

له سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا عائیشە هەر له مەدینە بوو و زانستی دەبەخشیەوە، بەڵام لە کاتی فیتنەی شەهیدکردنی عوثماندا، ئاشووبگێڕان سوودیان وەرگرت لەناوبانگی عائیشە تا دژ بە خەلیفە عوثمان بەکاری بهێنن.

کاتێك عوثمان گەمارۆ درابوو، عائیشە لە مەککە بوو، ئەوەبوو بەرەو مەدینە کەوتەوە رێ، بەڵام لە رێدا هەواڵی کوژرانی عوثمانی بیست، بۆیە گەڕایەوە بۆ مەککە و وتی بەخوا عوثمان بە بێتاوانی کوژرا و دەبێت داوای خوێنی بکەم.[8197]

مەسرووق دەڵێت بە عائیشەم وت: سەیری ئەو کارەت، نامەت بۆ خەڵك نووسیوەو داوات لێکردن تا دژ بە عوثمان راپەڕن، عائیشەش وتی سوێند بەوەی باوەرداران باوەڕیان پێ هێناوەو بێباوەڕان باوەڕیان پێ نەهێناوە من رەشیەکم لەسەر پەڕەی سپی بۆ نەنووسیون–واتە من هیچم بۆ نەنووسیون، ئەعمەش دەڵێت ئەو خەڵکە وایان دەزانی ئەو نامەیە لەسەر زاری عائیشەوە نووسراوە.[8198]

## له خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا

کاتێك عوثمان شەهید کرا دوای ئەوە بەیعەتی خیلافەت درا بە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو بەیعەتەکە هەموو موسڵمانانی لەخۆنەگرت، بەڵکو بەهۆی راجیایی سەبارەت بە خوێنی عوثمان فیتنەیەك لەنێوان هاوەڵاندا روویدا، ئەویش بوویە هۆی رووداني هەردوو جەنگی جەمەل و صفین، دواجاریش کێشەکە هەر بەو بارەیەوە مایەوە تا لەسەر دەستی حەسەنی کوڕی عەلی فیتنەکە کوژایەوە.

---

[8196] - صحيح البخاري، الرقم ١٣٣٩.

[8197] - الكامل في التاريخ، ج٣، ص ١٠٠.

[8198] - العواصم من القواصم.

بەو بەیعەتدانە موعاویە لە شام و خەڵکی شام مانەوەو بەیعەتیان نەدا بە عەلی، جگە لەوەی تەلحەو زوبەیرو دایکی باوەڕداران عائیشەش ئیجتیهادیان وابوو دەبێت بکوژانی عوثمان یەکسەر بکوژرێنەوە، بەڵام عەلی کوڕی ئەبووطالیب رای وابوو پەلە نەکرێت لە کوشتنەوەیان چونکە ئەوان لەناو مەدینەدان و سەربازانی دەوڵەتی ئیسلامیش لە دەرەوەن و ئەگەر هەیە خێرا بکرێت لە لێدانیان بتوانن مەدینە بگرن.

بەهەرحاڵ ئەمە بوویە هۆی کەوتنەوەی فیتنەیەکی گەورە کە ئەنجامێکی دڵتەزێنی هەبوو بۆ موسڵمانان و تا ئەمڕۆش ئاهی داخی ئەو فیتنەیە لای موسڵمانان گەرمەو هێشتا خەفەتیان بەو فیتنەیە دانەمرکاوەتەوەو بووە بە چەکێك بەدەست دوژمنانی ئیسلام و مێژووی ئیسلامی و هاوەڵانەوە تا داخی دڵی خۆیان بڕژن.

کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان کوژرا، دایکانی باوەڕداران (هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ)) چووبوون بۆ حەج بۆ مەککە تا لەدەست ئەو فیتنەی مەدینەی گرتووەتەوە رزگار بن، کاتێك ویستیان بگەڕێنەوە مەککە، هەواڵیان پێگەیشت کە عوثمان کوژراوە، بۆیە لە مەککە مانەوە تا بزانن بارەکە بە چی دەگات، ئەوەبوو بێ پێشنیازی خۆی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب بەیعەتی پێدرا، بەتایبەت کە خەواریجەکان زۆریان لە عەلی کرد هەرچەندە عەلی خۆی رقی بوو لێیان، بەڵام هیوای وابوو دەرفەتێکی بۆ بگونجێت تا لەناویان بەرێت، ئەوەبوو کە ئەو فشارە بینرا ژمارەیەك لە خزمانی عوثمان لە بەنوئومەییە دەرچوون بۆ مەککە، هەریەك لە زوبەیر و طەلحەش داوای مۆڵەتیان کرد تا بچن بۆ مەککەو عەلیش مۆڵەتی پێدان و ئەوانیش چوون بۆ مەککە، خەڵکێکی زۆریش شوێنیان کەوت، لە بەصرەو مەدینەو یەمەن و چەند شوێنی ترەوە خەڵکێکی زۆر روویکردە مەککەو لەوێ ژمارەیەکی زۆری هاوەڵان و دایکانی باوەڕداران و جەماوەرێك کۆبوونەوەو داوای خوێنی عوثمانیان دەکرد، عائیشەی دایکی باوەڕدارانیش جڵەوی مەسەلەکەی گرتبوویەدەست.[٨١٩٩]

لە مەککە سێ رای جیاواز دروست بوو، دەستەیەك وتیان با بچین بۆ لای موعاویە بۆ شام و لەوێوە بێین تۆڵە بکەینەوە، دەستەی دووەم وتیان بەڵکو با بچین بۆ مەدینە بۆ لای عەلی و داوای

---

٨١٩٩ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٠ – ٢٣١.

تۆڵەی عوثمان بکەینەوە، دەستەی سێیەم وتیان بەڵکو دەچین بۆ بەصرەو لەوێ خۆمان بەهێز دەکەین و هەر لەوێوە دەکەوینە لەناوبردنی بکوژانی عوثمان، ئەوەبوو لەسەر ئەم رایە رێککەوتن.[٨٢٠٠]

(سەبارەت بە چوونی —هاوەڵانی عائیشەو طەلحەو زوبەیر— بەرەو بەصرە راستەو هیچ کێشەیەکی لەسەر نیە، بەڵام بۆچی دەرچوون؟ لەمەدا گێڕانەوەیەکی لەسەر نیەو متمانە بە هیچ گێرانەوەیەکیان ناکرێت چونکە کەسی جێمتمانە نەیگێڕوانەتەوە، قسەی کەسی هەوادار وەرناگیرێت، حەزی تانەدان لە ئیسلام و بەکەمدانانی هاوەڵان چووەتە ناخی کەسی هەوادار و دەمارگیر.

لەوانەیە بۆ ئەوە دەرچووبن تا لەبەر شتێك کە بۆیان دەرکەوتووە ویستبێتیان عەلی —لە خیلافەت— لاببەن، بۆیەش بەیعەتیان دابێت تا شۆڕشگێڕەکان هێور ببنەوە، دواتر کەوتبنە داوای حەق.

لەوانەشە بۆیە چووبنە دەرەوە تا بکوژانی عوثمان لەناوبەرن.

لەوانەشە بە چەند دەستەیەکی موسڵمانانەوە دەرچووبن تا بیانگێڕنەوە بۆ یەك قانوون تا بەریەکنەکەون و دژ بەیەك نەجەنگن، ئەمەش دروستە نەك شتی تر، هەواڵی راستیش بەم جۆرە هاتووە.

سەبارەت بە گێڕانەوەکانی بەشەکانی یەکەم هەموویان پووچ و لاوازن.

سەبارەت بەوەی ئەوان بە زۆر و ناچاری بەیعەتیان دابێت ئەوە بێبنەما و پووچەو پێشتریش روونمان کردوەتەوە.

سەبارەت بەوەی ویستبێتیان عەلی لە خیلافەت لاببەن ئەمەش بێ بنەما و پووچە، چونکە لابردن بە راو روانینی هەموان دەبێت، دەکرێت یەك یان دوو کەس لە دەسەڵاتدا بن، بەڵام لابردن تەنها دوای سەلماندن و روونکردنەوە دەبێت.

سەبارەت بەوەش کە لەوانەیە بۆ کوشتنی بکوژانی عوثمان دەرچووبن، پێش ئەمە کارەکە بنەرەتەکەی بۆ یەکدەنگی بووە، دەشکرێت هەردوو مەسەلەکە پێکەوە بن.

---

٨٢٠٠ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣١.

دەگێردرێتەوە لە کاتی ئامادەنەبوونی– طەلحە و زوبەیر و عائیشە لە مەدینەدا– ئاژاوەی نێوان خەڵك نەما، طەلحە و زوبەیر و عائیشەش دایکی باوەڕدارانیش بەو هیوایە چوونەدەرەوە تا خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ لای دایکیانو رەچاوی حورمەتی پێغەمبەرەکەیان بکەن).[٨٢٠١]

کە گەیشتنە بەصرە بەرپرسی ئەوێ نوێنەری نارد تا بزانێت بۆچی هاتون، چوونە لای عائیشە وتیان بۆچی هاتویت؟ وتی بۆ داوای خوێنی عوثمان هاتوین، چوونە لای طەلحە ، ئەویش هەمان شتی وت، چوونە لای زوبەیریش ئەویش هەمان شتی وت.[٨٢٠٢]

بەڵام سوپاکەی عوثمانی کوڕی حنیف بەوە رازی نەبوون و هەوڵیاندەدا لەگەڵ سوپای عائیشە بجەنگن، عائیشەش فەرمانی کرد کەس جەنگ نەکات، رۆژێك خۆیان پاراست، بەڵام لە رۆژی دووەمدا جەنگ روویدا و ژمارەیەك لە هاوەڵان و کەسانی تر کوژران.[٨٢٠٣]

دواتر بڕیاریان دا هەواڵ وەربگرن ئەگەر طەلحەو زوبەیر بە ناچاری بەیعەتیان دابوو ئەوە عوثمان بەصرەیان بۆ چۆڵ بکات، ئەگەریش بە ویستی خۆیان بووبێت ئەوە ئەو دوانە دەبێت بەصرە چۆڵ بکەن، نوێنەریان ناردە مەدینەو نوێنەر هەواڵی پرسی، کەس وەڵامی نەدەدایەوە جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید کە وتی بەخوا بە ناچاری بەیعەتیان دا، کەچی خەڵکانێك هەڵمەتیان بۆ برد، چەند هاوەڵێك رزگاریان کرد، بارەکە نەگەیشتە ئەنجام.[٨٢٠٤]

لە بەصرە جەنگ روویداو ژمارەیەکی تر کوژران و عوثمان بەدیل گیرا و برا بۆ لای عائیشە، ئەویش داوای کرد ئازاد بکرێت، بەڵام شار کەوتە دەست سوپای عائیشە.[٨٢٠٥]

عەلی کوڕی ئەبوو طالیب کە ئەمەی بیست بڕیاریدا بچێت بەرەو بەصرە، خەڵکێکی کەمی مەدینەی لەگەڵ بوو، ژمارەیەك لە هاوەڵانی بەشداربووی غەزای بەدری لەگەڵدا بوو، ژمارەی سوپاکەی عەلی تەنها نۆسەد کەس بوو، حەسەنی کوڕی داوای لێکرد نەچێت، عەبدوڵای کوڕی سەلامیش هەمان

---

٨٢٠١ - العوصم من القواصم لابن العربي.

٨٢٠٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٢.

٨٢٠٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٣.

٨٢٠٤ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٣.

٨٢٠٥ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٣.

داوای لێکرد، بەڵام عەلی رازی نەبوو، ئینجا هەواڵی نارد بۆ کووفە تا بدەنە پاڵی، بەرەبەرە سوپاکەی عەلی روی لە زیاد بوون بوو.[٨٢٠٦]

عەلی کە عوثمانی کوڕی حنیفی بینی و هەواڵی کارەکانی طەلحەو زوبەیری بیست، نزای کرد خوایە طەلحەو زوبەیر بەرامبەر بەو هەڵەی کردوویانە بێدار بکەیتەوە.[٨٢٠٧]

کاتێك زوبەیر لە بەصرە بوو کەسێك هات بۆ لای و وتی ئەرێ بچم عەلی بکوژم؟ ئەویش وتی چۆن دەیکوژیت لەکاتێکدا سەربازی زۆری لەگەڵدایە؟ ئەویش وتی دەچمە ناو سوپاکەی و خۆمی لێ نزیك دەکەمەوەو دواتر دەرفەتی لێ دێنم، زوبەیر وتی پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو:(الإيمان قيد الفتك، لا يفتك مؤمن)،[٨٢٠٨] (ئیمان نامەردکوژی کۆت کردووە، باوەڕدار نامەردکوژی ناکات).

دواجار قەعقاع کەوتە نێوانەوە، چوویە بەصرەو طەلحەو زوبەیری بانگهێشت کرد بۆ یەکڕیزی و دوورگرتن لە دووبەرەکی، سەرەتا لەگەڵ عائیشە قسەی کرد و وتی دایە گیان بۆچی هاتوویتەتە ئێرە؟ ئەویش وتی کوڕی شیرینم بۆ رێککردنی باری نێوان خەڵك، ئینجا قەعقاع داوای کرد طەلحەو زوبەیریش بانگ بکات، ئەوانیش هاتن قەعقاع وتی دایکی باوەڕداران دەڵێت بۆ صولح هاتوم، ئەوانیش وتیان ئێمەش بەس بۆ ئەوە هاتوین، ئەویش وتی دەی پێم بڵێن ئەو صولحەتان لە چ روانگەیەکەوەیە؟ ئەگەر بە رەوامان زانی شوێنتان دەکەوین، ئەگەریش بە رەوامان نەزانی ئیتر هیچ، ئەوانیش وتیان بکوژانی عوثمانمان دەوێن لەناوببرێن، قەعقاع وتی خۆ ئێوە بکوژانی ئەوتان لە بەصرە کوشت، شەش سەد کەستان کوشت شەش هەزار کەس چوونە ریزی ئەوانەوەو دژتان وەستان، داوای تەنها کەسێکتان کرد کە حرقووص بوو شەش هەزار کەس بوونە پارێزەری، ئەمەی ئێوە داوای دەکەن بۆ چاکەیە، بەڵام خراپەیەکی زۆر گەورەی لێدەکەوێتەوە، عائیشە وتی ئەی تۆ چ چارەسەرێکت پێیە؟ قەعقاع وتی من پێم وایە دەرمانی ئەم دەردە ئارامگرتنە تا بارەکە هێور دەبێتەوە، ئەمە بکەن خێر و رەحمەت دێت، ئەگەریش رازی نەبن باری خراپە زیاتر دەبێت بۆ هەردوو لامان، ئەوانیش وتینا دەی بۆچوونەکەت زۆ دروستە، برۆ ئەگەر عەلیش هەمان رای هەبوو رازی دەبین، ئەویش چوویەوە بینی عەلی هەمان رای هەیە، ئیتر هەردوولا رێککەوتن، عائیشەش نوێنەری نارد بۆ لای عەلی تا پێی بڵێت ئەو تەنها بۆ صولح

---

٨٢٠٦ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٤ — ٢٣٥.

٨٢٠٧ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٥.

٨٢٠٨ - مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٦٧٥٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٣٧٥، صححه شعيب الأرناؤوط.

هاتووە، هەردوولا دڵخۆش بوون و عەلیش وتارێکی پێشکەش کرد بۆ خەڵکەکە کە تیایدا باسی خراپەی دووبەرەکی کرد و نیازی رێککەوتنەکەی خستەڕوو.[٨٢٠٩]

## جەنگی جەمەل

کاتێك لە وتارەکەی عەلیەوە دەستەی ئاژاوەگێڕان زانییان خەریکە رێکدەکەون، کەوتنە خۆ، لەوانە ئەشتەری نەخەعی و عەبدولآی کوڕی سەبەء و شریح و سالم و چەندێکی تر کە هیچ هاوەڵێکیان تێدا نەبوو نزیکەی دوو هەزار و پێنج سەد کەسێك دەبوون کەوتنەخۆ و وتیان ئەم رێککەوتنە دژ بە ئێمەیەو ژمارەشمان کەمە و رێککەوتنی ئەوان تەنها لەسەر خوێنی ئێمەیە، بۆیە دەبێت عەلیش وەك عوثمان لێبکەین، خەڵکەکەش رازی بوون، بەڵام عەبدولآی کوڕی سەبەء وتی راکەتان زۆر خراپە، چونکە ئەوکات هەردوولا دەبنە دوژمن و لێتان دەدەن، بەڵکو دەبێت جەنگ لەنێوان ئەم دوو دەستەیەدا هەڵگیرسێنین، کاتێك زوبەیر و طەلحە چوون بۆ لای عەلی تا رێکبکەون، دەستەی سەبەئیەکان خۆیان بەشکرد بەسەر هەردوولادا و جەنگیان هەڵگیرساند، هەردوولا وایانزانی بەرامبەر ناپاکی نواندووە، بۆیە کەوتنە هێرش، سوپای عەلی نزیکەی بیست هەزار کەس و سوپای عائیشەش نیکەی سی هەزار کەس دەبوون، جەنگێکی قورس روویدا، عەلی هاواری دەکرد دەست هەڵگرن، بەڵام کەس نەیدەبیست، لەولاشەوە عائیشە بە سواری وشترێکەوە بۆ هەمان نیاز هات، عەلی هێندە بێزار بوو بە حەسەنی کوڕی دەوت کورِم خۆزگە باوکت بیست ساڵ لەمەوبەر دەمرد، عەلی چو تا زوبەیر و طەلحە بدوێنێت، وتی ئەم سوپایەتان ئامادە کردووە، بیانووشتان بۆ قیامەتتان ئامادە کردووە؟ دەی لەخوا بترسن، من خوێنی ئێوەم حەڵاڵ نەکردووە، ئێوە هیچ بەڵگەیەکتان پێیە بۆ رەوایی خوێنی من؟[٨٢١٠]

عەبدولآی کوڕی زوبەیر کە خوشکەزای عائیشە بوو، جڵەوی وشترەکەی عائیشەی پووری گرتبوو و ئاگاداری پووری بوو و هیچ قسەیەکیشی نەدەکرد، لەو کاتەدا ئەشتەری نەخەعی هەڵمەتی بۆ برد و یەکتریان بریندار کرد، عەبدولآ هێندە بریندار بوو کە دەوترێت نزیکەی سی و حەوت برینی پێوە بووە.[٨٢١١]

---

٨٢٠٩ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٧.

٨٢١٠ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٨ – ٢٤١.

٨٢١١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٤٤.

بەردەوام سوپای عەلی هەوڵیان دەدا وشترەکەی عائیشە بخەن تا بەوە سەرکەوتن رابگەیەنن، ئەوەبوو کوشتارێکی زۆر کرا تا دواجار توانییان وشترەکە بپێکن و بیخەن و عائیشەش لە کەژاوەکەی کەوتە خوارەوە، عەلی فەرمانی کرد خێرا کەژاوەکەی عائیشە ببەنە دەرەوەو فەرمانی کرد موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکر و عەممار خیوەتێکیان بۆ هەڵدا، موحەممەدی برای عائیشە لەناو سوپای عەلیدا بوو، ئینجا عەلی هات بۆ لای عائیشە و وتی دایەگیان چۆنیت؟ وتی باشم، عەلی وتی خوا لێت خۆش بێت، ئینجا یەك یەك سەرکردەو کەسایەتیەکان دەهاتن سەلامیان دەکرد لە عائیشە، دواتر کە شەو داهات عائیشە هاودەم بە موحەممەدی برای چوونەوە بەصرە، ئینجا عەلی پاش سێ رۆژ فەرمانی کرد چی کەلوپەلێ گیراوە ببرێتە بەصرەو هەوادارانی عائیشە بێن چییان هەبووە بیبەنەوە، خەڵکێ گلەییان کرد کە بۆچی خوێنیان رەوا بێت کەچی سامانیان رەوا نەبێت، با بیبەین، عەلیش بە توورەییەوە وەك تانەیەك بۆیان وتی کامتان پێی خۆشە دایکی باوەڕداران ببات بۆ خۆی؟ هەمووان بێدەنگ بوون، دواتر عائیشە بڕیاری دا بەصرە جێبهێڵێت، عەلی هەموو پێداویستیەکی بۆ ئامادە کرد و مۆڵەتی دا هەرکەسیش لە سوپاکەی رزگار بووە لەگەڵی بگەڕێتەوە، ئینجا چل ئافرەتی بەصرەی هەڵبژارد تا لەگەڵ عائیشە بچنەوە، موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکریشی لەگەڵ ناردەوە، ئەو رۆژەی بڕیار بوو عائیشە بڕوات، عەلی هاتە بەردەگاو عائیشەش بە کەژاوەکەوە هێنرایە دەرەوەو ماڵئاوایی لە خەڵك دەکرد، عائیشە وتی کوڕە شیرینەکانم، کەستان لەسەر ئەم بارە سەرکۆنەمان نەکات، بەخوا نێوانی من و عەلی تەنها وەك ئافرەت و پارێزەرانی وایە و ئەو لای من لە کەسە هەرە چاکەکانە، عەلیش وتی بەخوا راست دەکات نێوانمان وایە و ئەو هاوسەری پێغەمبەرەکەتانە لە دنیا و ئاخیرەتدا، ئینجا عەلی چەند کیلۆمەترێك لەگەڵ عائیشە چوو و بەڕێی کرد، عائیشەش چوو بەرەو مەککەو لەوێ حەجی ئەو ساڵەی کرد و دواتر گەڕایەوە بۆ مەدینە.[٨٢١٢]

هەر لەو کاتەی عائیشە لە بەصرە بوو، عەلی کوڕی ئەبووطالیب گلەیی لە عائیشە دەکرد کە بۆچی وایکرد، عائیشەش زۆر پەشیمان بوو، دواتر عەلی کاروانی ئامادە کرد و عائیشەی بەرەو مەدینە ناردەوەو دوانزە هەزاریشی پێدا.[٨٢١٣]

---

[٨٢١٢] - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٤٠٢٤٧.

[٨٢١٣] - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٧٨.

عائیشه دوای جەنگی جەمەل زۆرپەشیمان بوو کە چووبوو بەرەو بەصرەو لە جەمەلدا بەشداری کردبوو، پێشتریش واینەدەزانی بارەکە دەگاتە ئەوە، بۆیە دوای جەنگی جەمەل هەرکات ئەو ئایەتە بخوێنرایە(وقرن في بيوتكن)(ئەی ئافرەتان لە ماڵەکانتاندا ئۆقرە بگرن)، عائیشە هێندە دەگریا تا کولّمەکانی تەڕ دەبوون.[٨٢١٤]

## لە خیلافەتی حەسەنی کوڕی عەلیدا

عائیشە لەو ماوەیەدا لە مەدینە مابوویەوەو کەناری گرتبوو و لە مەسەلە سیاسیەکاندا هیچ قسەو کردارێکی نەبوو، پەیوەندیشی لەگەڵ حەسەندا زۆر چاك بوو، تەنانەت دوای ئەوەش کە وازی هێنا لە خیلافەت، حەسەنی کوڕی عەلی لە سەرەمەرگیدا حوسەینی برای بانگ کرد و وەسیەتی بۆ کرد، تیایدا وتی: داوام لە عائیشە کردووە ئەگەر مردم مۆڵەتم بدات لە ماڵەکەی ئەودا لەلای پێغەمبەر (ﷺ) ئەسپەردە بکرێم، ئەویش رازی بووە، دەڵێم لەوانەیە لە شەرمدا وتبێتی بەڵێ و رازی بووبێت، بۆیە ئەگەر مردم برۆ بۆ لای و داوای هەمان شتی لێ بکەرەوە، ئەگەر پێی خۆش بوو ئەوە لە ماڵەکەی ئەودا ئەسپەردەم بکە، گومانم زۆرە خەڵکێك نەهێڵن ئەوە بکەیت، جا ئەگەر رێگرییان لێکردیت لەسەر ئەوە لێیان مەپاڕێرەوەو لەسەری مەڕۆ و لە بەقیع ئەسپەردەم بکە، چونکە لەوێش کەسانی پێشەنگی لێیە).[٨٢١٥]

کاتێك حەسەنی کوڕی عەلی وەفاتی کرد، لەسەر وەسیەتی خۆی حوسەینی برای چوو بۆ لای عائیشەو داوای لێکردەوە کە حەسەنی برای لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەسپەردە بکرێت، ئەویش رازی بوو و وتی باشە، بەڵام مەروان کە ئەمەی بیست وتی سوێند بەخوا نابێت حەسەن لەوێ ئەسپەردە بکرێت، نەیانهێشت عوسمان لەوێ ئەسپەردە بکرێت و ئێستا ئەمان دەیانەوێت حەسەن لەوێ ئەسپەردە بکەن؟ ئەوەبوو رێی نەدا و لە بەقیع ئەسپەردە کرا.[٨٢١٦]

---

٨٢١٤ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٧٧.

٨٢١٥ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩١-٣٩٢.

٨٢١٦ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩٢.

جارێك موعاویەی كوڕی ئەبووسوفیان سەد هەزار درهەمی نارد بۆ عائیشە، عائیشەش لە پەسا كەوتە بەخشینەوەی تا هیچی نەما، خزمەتكارەكەی وتی جا با بە درهەمێكی كەمیٚ گۆشتت بۆ ئێمەش بكڕیایە، عائیشە وتی جا با قسەت بكردایە.[٨٢١٧]

كاتێك موعاویەی كوڕی ئەبوسوفیان بەیعەتی بۆ یەزیدی كوڕی وەرگرت، حوسەینی كوڕی عەلی و چەندێكی دی نارازی بوون، جا عائیشە وای بیست كە موعاویە هەڕەشەی لەوانە كردووە ئەگەر بەیعەت نەدەن دەیانكوژێت، بۆیە ئامۆژگاری موعاویەی كرد و پێی وت بیستوومە هەڕەشەی كوشتنت لەوانە كردووە ! موعاویە وتی ئەی دایكی باوەڕداران ئەوانە زۆر لەوە شكۆدارترن كە هەڕەشەی كوشتنیان لیٚ بكەم، بەڵام من بەیعەتم بۆ یەزید وەرگرتووەو خەڵكی جگە لەوان بەیعەتیان داوە، جا رات وایە دوای ئەو هەمووە بەیعەتەكەی لەكار بخەم؟ عائیشە وتی دەی بەرامبەریان نەرمونیان بە، ئەگەر خوا بیەوێت دێنە سەر راكەت، موعاویەش وتی وادەكەم.[٨٢١٨]

## وەفاتی عائیشە

سەبارەت بە ساڵی وەفاتی عائیشە دەستەیەك دەڵێن لە ساڵی پەنجاو حەوتی كۆچیدا بووە، دەستەیەكیش دەڵێن لە ساڵی پەنجاو هەشتی كۆچیدا بووە، كاتەكەشی لە شەودا بوو، لە شەوی سیٚ شەممە حەڤدەی مانگی رەمەزاندا بوو،[٨٢١٩] پاش ئەوەی نوێژی ویتر كرا وەفاتی كرد، خۆیشی فەرمانی كردبوو هەر شەو تەرمەكەی ئەسپەردە بكەن.[٨٢٢٠]

كاتێك عائیشە لە سەرەمەرگدا بوو، ئیبن عەبباس هات بۆ لای، عائیشە وتی دواجار هاتیت؟ عەبدوڵای برازایشی لەلای سەریەوە بوو، وتی ئەوە ئیبن عەبباسەو داوای مۆڵەت دەكات، عائیشە وتی وازم لیٚ بێنە پێویستم بە هاتن و تەزكیەی ئەو نیە، عەبدوڵا وتی دایە گیان ئیبن عەبباس لە كوڕە چاكەكانتەو هاتووە بۆ ماڵئاوایی و سەلام لێكردنت، ئەویش وتی ئەگەر حەز دەكەیت مۆڵەتی بدە، ئیبن عەبباس هات و دانیشت و وتی موژدەت لیٚ بێت، بەخوا تەنها دەرچوونی رۆحت لە جەستەت رێگرە لە گەیشتنت بە موحەممەد و ئازیزان، ئەویش وتی وایە ئیبن عەبباس، ئیبن عەبباس وتی تۆ

---

[٨٢١٧] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٨٧.

[٨٢١٨] - الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٣٥٣.

[٨٢١٩] - أسد الغابة، ج٧، ص ٢٠٨.

[٨٢٢٠] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٩٢.

خۆشەویستترین هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) بووی لا پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش تەنها کەسی پاکی خۆشدەویست، ئینجا بەسەرهاتی دابەزینی ئایەتی تەیەمومەکەی بۆ گێڕایەوە، ئینجا وتی دواتر خوای گەورە ئایەتی تایبەت بە پاکی تۆی دابەزاند و لەوسا بەدوا چی مزگەوتێ یادی خوای تێدا بکرێت تیایدا پاکی تۆیش باس دەکرێت، عائیشە وتی وازم لێ بێنە ئیبن عەبباس خۆزگە باسم ببڕایەتەوەو ناوم لەناوانا نەبوایە.[٨٢٢١]

لە سەرەمەرگیدا بوو کە داخی ڕووداوی جەمەلی لەیاد نەدەچوو چی کردووە، بۆیە وتی من دامنابو لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی خۆمدا ئەسپەردە بکرێم، بەڵام دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) بەزمم سازاند، بۆیە بمبەن لەگەڵ هاوسەرەکانی تری پێغەمبەر (ﷺ) ئەسپەردەم بکەن، ئیتر برا لە بەقیع ئەسپەردە کرا.[٨٢٢٢]

کاتێك وەفاتی کرد ئەبووهورەیرە نوێژی لە سەر تەرمەکەی کرد و دواتر تەرمەکەی لە بەقیع ئەسپەردە کرا.[٨٢٢٣]

هەریەك لە عەبدوڵای کوڕی زوبەیر و عورووەی کوڕی زوبەیر کە خوشکەزای بوون و قاسم و عەبدوڵای کوڕانی موحەممەد کە برازای بوون و عەبدوڵای کوڕی عەبدوڕەحمان کە ئەویش برازای بوو تەرمەکەیان خستە ناو گۆڕەکەوە.[٨٢٢٤]

کاتێك وەفاتی کرد تەمەنی شەست و سێ ساڵ و چەند مانگێك بوو.[٨٢٢٥]

عائیشە ئافرەتێکی زۆر زانا بوو، گەورە هاوەڵان سەبارەت بە فەرزو سوننەتەکان پرسیاریان لەو دەکرد،[٨٢٢٦] ئەوەش نامۆ نیە، چونکە نزیکترین کەس و خۆشەویستترین کەسی پێغەمبەر (ﷺ) بووە.

---

[٨٢٢١] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٨٠.

[٨٢٢٢] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٩٣.

[٨٢٢٣] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٩٢.

[٨٢٢٤] - أسد الغابة، ج٧، ص ٢٠٨.

[٨٢٢٥] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٩٣.

[٨٢٢٦] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٨٠-١٨٣.

## چەند فەرموودەیەك كە عائیشە دەیانگێڕێتەوە:

عائیشە دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) حەزی بەوە بوو لە نەعل لەپێكردن و قژ داهێنان و دەستنوێژ و هەموو كارێكی تریدا لەلای راستەوە دەست پێبكات.[8227]

عائیشە دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی(إذا نعس أحدكم وهو يصلي فليرقد، حتى يذهب عنه النوم ، فإن أحدكم إذا صلى وهو ناعس، لا يدري لعله يستغفر فيسب نفسه)،[8228] (ئەگەر یەكێكتان لە كاتی نوێژدا باوێشكی دا، با رابكشێت تا خەوەكەی دەڕوات، چونكە لەوانەیە یەكێكتان بە باوێشكەوە نوێژ بكات و نەزانێت چی دەڵێت لەبری داوای لێخۆشبوون قسە بە خۆی بڵێت).

عائیشەی دایكی باوەڕداران دەڵێت جارێك پێغەمبەر (ﷺ) بە جلێكی رەشەوە نوێژی دەكرد كە بڕێك گوڵنك و شتی پێوە بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەم گوڵنك و شتانەی ئەم جلەم لە نوێژەكەم سەرقاڵم دەكەن، ئەمە ببەن بۆ ئەبوو جەهم و ئینبیجانیەتەكەی ئەوم بۆ بهێنن،[8229] ئەوەبوو جلێكی كوردی ئەبوو جەهمی كردەبەری.[8230]

وشەی ئینبیجانیەت وا پێناسەی هاتووە كە جلێكی لە خوری دروست كراو و زۆر زبرە.[8231]

بەو پێیە بێت دەبێت ئەو جلەی پێغەمبەر (ﷺ) پۆشیویەتی جلێكی وەك شاڵ بووبێت.

عائیشە دەڵێت داوای مۆڵەتم لە پێغەمبەر (ﷺ) كرد تا بەشداری جیهاد بم، فەرمووی (جیهادی ئێوەی ئافرەتان حەجە).[8232]

---

[8227] - صحيح البخاري، الرقم ١٦٥، صحيح مسلم، الرقم ٤٢٢.

[8228] - صحيح البخاري، الرقم ٢٠٨، صحيح مسلم، الرقم ١٣٤٩، صحيح ابن حبان، الرقم ٢٦٢٥، سنن الدارمي، الرقم ١٤٠٣، سنن أبي داود، الرقم ١١٢٨، سنن ابن ماجة، الرقم ١٣٦٦، سنن الترمذي، الرقم ٣٣١، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٤٣٨٧، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٨٠٥٩.

[8229] - صحيح البخاري، الرقم ٣٦٩، صحيح مسلم، الرقم ٨٩٥ ، سنن أبي داود، الرقم ٧٩٣، صحيح ابن حبان، الرقم ٢٣٦٨، سنن ابن ماجة، الرقم ٣٥٤٧.

٨٢٣٠ - سنن أبي داود، الرقم ٧٩٣، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٩١٥.

٨٢٣١ - النهاية في غريب الحديث و الأثر، ج١، ص ٧٣.

[8232] - صحيح البخاري، الرقم ٢٧٤١.

# عائیشە لەنێوان هەوادارن و نەیارانیدا

بە گشتی ئەوانەی هەڵوێستی نەیارییان هەیە بەرامبەر بە دایکی باوەڕداران عائیشە، خۆیان لە دوو دەستەدا دەبیننەوە:

دەستەی یەکەم: دڵسۆزانێکی ئیسلام کە بە نەشارەزایی هەڵوێست دەنوێنن، ئەوانە پێیان وایە کە شکاندنی عائیشەو تانە لێدانی سەرخستنی دینە، ئەمانەش چەند جۆرێکن:

هەوادارانی ئالوبەیتی پێغەمبەر (ﷺ) کە بەپێی شرۆڤەیەکی مەزهەبی پێیان وایە ئالوبەیت تەنها لە خێزانی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بەرتەسك بووەتەوە، جا قەناعەتیشیان پێ کراوە کە عائیشەو عەلی هەر لە کۆنەوە نەیاری یەك بوون و عائیشە ئامانجی بووە هەر مافێکی ئاسمانی و زەمینی عەلی زەوت بکات و وا بکات بە مافی ڕەوای خۆی نەگات، ئیتر لێرەوە لە بری گەڕانێکی بێلایەنانە بە دوای ڕاستیەکاندا، دەکەونە هەوڵی کۆکردنەوەی بەڵگە بۆ ئەو قەناعەتەیان، جا چ داماویەك، چاو لە ئایەتێ دابخەن کە عائیشەی بە دایکی باوەڕداران دانابێت و بەدوای بڕێ ڕیوایەتی بێ سەنەددا بگەڕێن، ئەمانە پێویستیان بە دڵسۆزی هەیە، دەبێت کەسانێکی دڵسۆزی شارەزای نەرمونیان ببنە هاریکاریان و بەو چاوەوە بۆیان بڕوانن کە خوشك و برای خۆیانن و خەریکە دەکەونە چاڵێکی ئاگرینەوە، تا لێواری چاڵەکە دەبێت دەستیان ڕاکێشن بەرەو ئەملا، ئەو کاتەی هیوای ڕزگاربوون نەما ئەوجا دەستیان لێ بەربدەن تا ئەوانیش نەکەونە ئەو چاڵەوە، بەڵام نابێت لە نێوەندی ئەو دڵسۆزی نواندن و نەرمونیانیەدا دەستبەرداری تاکە حەقیقەتێك بن، چۆن ڕاشکاوانە دەبێت بڵێن عائیشە لە خیلافەتی عەلیدا ئیجتیهادی هەڵەی کرد، بە هەمان شێوە دەبێت تا دواجار جەخت لەوە بکەنەوە عائیشە پاك بووەو دایکی باوەڕداران و خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) و گەورە زانایەکی ئوممەتی ئیسلام بووە.

دەستەیەکی تر لەوانەی دڵسۆزیەکی نەشارەزایانە دەنوێنن، بریتین لە موسڵمانانێکی دەروون بەزیو بەرامبەر بە نەیارانی ئیسلام و مێژووی ئیسلام و لەپێناو ڕازیکردنی دڵی نەیارانی ئیسلامدا ئامادەن تانە بدەن لە عائیشەو ئەوەش بە پاراستنی دین بزانن، وادەزانن ئەگەر بڵێن عائیشە هەندێ فەرموودەی هەڵبەستووە بەدەم پێغەمبەرەوە(ﷺ)، ئیتر ئیسلامیان سەرخستووە، بێئاگا لەوەی خوا بە دەقی ئایەت ڕاستگۆیی عائیشەی سەلماندووە.

یان هەندێ لەپێناو ڕاگرتنی بەرزی و شکۆی کەسانێکی تری وەك خەدیجە یان فاطیمەو...هتد، دێن لە شان و شکۆی عائیشە کەم دەکەنەوە، تا لەو مشتومڕەی دەوترێت عائیشە پلەی بەرزترە یان

خەدیجە یان عائیشەو فاطیمە کامیان پلەیان بەرزترە، بەڵکو عائیشە بخەنە ریزی دووەمەوە، هەموو ئەم جۆرە کەسانەی وا دەڕواننە عائیشە نیەتێکی چاك و ڕێگەیەکی هەڵەو خراپیان گرتووەتەبەر.

دەستەی دووەم: نەیارانێکی شارەزای کینەلەدڵ، ئەمانە لە نەشارەزاییانەوە نیە تانە دەدەن لە عائیشە، بەڵکو چاك شارەزای بارەکەن، بەڵام لەپێناو سەرخستنی بڕواو روانینی خۆیان دەنەونە تانەدان لە عائیشە، جا ئەمانە یان کەسانێکن لەنێو رێبازی شیعەدا، یان کەسانێکن لە رۆژهەڵاتناسان کە مەبەستیانە لە خستنی عائیشەوە بدەن لە خودی کەسێتی پێغەمبەر (ﷺ)، زمان و دەست و دڵی ئەمانە بە دوو هۆکار دەوەستێت، یان خوای گەورە رێنموونییان پیٚ ببەخشێت، یان موسڵمانان وەڵامی رەواو یەکلا بە گومانەکانیان بخەنەڕوو، هەر هێرشێکی هەرچەشنەی ئەوان وەڵام بدەنەوە.

خستنی عائیشەو تانەلێدانی تەنها بریتی نیە لە لابردنی کەسێتیەك لە مێژووی ئیسلامیدا و بەس، بەڵکو ئەگەر بڵێین ئەو تۆمەتانەی دەدرێنەوە پاڵ عائیشە راستن، ئەوە ئەبێت بەم دەرەنجامانەش رازی بین:

یەکەم: گومان کردن لە قورئانی پیرۆز، چونکە قورئانی پیرۆز عائیشەی بە دایکی باوەڕداران ناوبردووە(ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡۗ)، جا چۆن دەکرێت قورئان ئافرتێکی خراپەکار بە دایکی باوەڕداران وەسف بکات، نەك تەنها دایکی موسڵمانان، بەڵکو دایکی باوەڕداران، وەك دەشزانین باوەڕداری پلەیەکی بەرزترە لە موسڵمانێتی، هەروەها خوای گەورە بە دەقی ئایەت پاکی عائیشەی سەلماندووە وەك پێشتر لە رووداوی ئیفکدا باسمان کرد.

دووەم: گومان لە پێغەمبەر (ﷺ) بکەین، چ لە راستگۆیی، چ لە غیرەتی، چ لە پەیڕەوی، چونکە چۆن دەکرێت پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتێك بە هاوسەری خۆی بهێڵێتەوە کە تووشی زینا بووبێت، هاوکات لەسەر ئەو ئافرەتە سزای هاوەڵانی خۆی بدات، پاشان حوکمی ئیسلامی بەسەردا جێبەجیٚ نەکات لە کاتێکدا سوێندی دەخوارد کە ئەگەر فاطیمەی کچم دزی بکات دەستی دەبڕم.

سێیەم: بە خستنی عائیشە بە جارێك سەدان فەرموودەی ناو کتێبەکانی فەرموودە لەکاردەکەون، چونکە گێڕەرەوەکەیان عائیشە بووە، جا عائیشە خۆی هێندە تاوانی هەبووبێت، چۆن فەرموودەی لێوە وەربگیرێت؟!

چوارەم: عەلی کوڕی ئەبوو طالیب ستەمێکی گەورەی کردووە کە ئافرەتێکی وا تاوانباری پاش جەنگێکی سەخت و خوێن ڕژانێك گرتبێت، ئینجا بە دایك ناوی ببات و بەڕێی بکات بۆ مەدینەو پارەشی پیێ بدات و هیچ سزایەکی نەدات، لەکاتێکدا بەرامبەر بە خەواریجەکان ئەوەی کرد کە کردی.

پێنجەم: کۆمەڵگەی سەردەمی هاوەڵان و دەستەی یەکەمی خوێندکارانی پێغەمبەر (ﷺ) تاوانبار بوون کە هێشتوویانە ئافرەتێکی وا بتوانێت بەو هەموو تاوانەوە ڕێزەوی بەشێك لە کۆمەڵگەی ئیسلامی و لایەکی فراوانی زانستی ئیسلامی بگرێتە دەست.

بۆیە مەسەلەی تانەدان لە عائیشە، تەنها تانەدان نیە لە کەسایەتیەکی ئاسایی و بەوە کۆتایی بێت، بەڵکو تانەدانە لە کەسێتیەك کە بەشێك لە بنەڕەتەکانی ئەم دینە پێوەی پەیوەست بوون، قورئان و پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان و کۆگایەك لە فەرموودەو فەتوا، ناشگونجێت یەك کۆمەڵگەی گەورە دەرفەت بدەن ئافرەتێکی خراپ(دوور لە دایکمان عائیشە) بتوانێت بە ویستی خۆی چی دەوێت بیکات.

## عائیشەو بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبووطالیب

پەیوەندی نێوان عائیشەی دایکی باوەڕداران و خێزانی عەلی کوڕی ئەبووطالیب پەیوەندیەکی دۆستانە بوو و هەرکام لەوان فەزڵی یەکتریان دەزانی، فەرموودەکانیش شایەتی ئەو راستیەن، لێرەشدا بە نموونە چەند گێڕانەوەیەك دەخەینەڕوو:

عائیشەو فاطیمەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) پێکەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە:

عائیشە دەڵێت دوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، زەیدی کوڕی حارثەی نارد بۆ لامان و ئەبوورافیعی مەولاشی لەگەڵدا نارد، دوو وشتر و پێنج سەد درهەمی پێدان تا بۆ کۆچەکە چی وشتریان پێویستە بیکڕن، ئەبووبەکریش عەبدوڵای کوڕی ئورەیقیطی بە دوو یان سێ وشترەوە نارد و نامەیەکی نووسی بۆ عەبدوڵای کوڕی ئەبووبەکر و فەرمانی پێدەکرد دایکی و من و ئەسمائی خوشکم بەودا بنێرێت بۆ مەدینە، ئەوەبوو کەوتنەڕێ، لەنیوەی ڕێدا زەید بە پارەکە سێ وشتری کڕی، دواتر هەموویان هاتنە مەککەو ڕێیان کەوتە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا کە دەیویست خێزانی ئەبووبەکر ببات بۆ مەدینە، ئەوەبوو هەموومان کەوتینەڕێ، زەید و ئەبوورافیع فاطیمە و ئومموکلثوم و سەودەی کچی زەمعەیان هێنان، هەروەها زەید ئوممو‌ئەیمەن و ئوسامەی کوڕی زەیدی هێنا، عەبدوڵای کوڕی

ئەبووبەکریش دایکم و من و ئەسمائی هێنا، طەلحەش هاودەم بە ئێمە هات و هەموو پێکەوە کەوتینەڕێ تا گەیشتینە مەدینە، ئەو کات موسڵمانان خەریکی دروستکردنی مزگەوتی مەدینە بوون.[٨٢٣٣]

فاطیمە بە پێغەمبەری خوای(ﷺ) وت بەڵێ خۆشم دەوێت:

جارێك هەندێ لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کۆبوونەوە تا نارەزایی دەربڕن بەرامبەر بەو خۆشەویستیە زۆرەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هەیبوو بۆ عائیشە، فاطیمەی کچی پێغەمبەریان (ﷺ) نارد بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و تیان پێی بڵێ بۆ خاتری خوا لە خۆشەویستی بۆ عائیشە دادپەروەر بێت، ئەویش چوو و ئەوەی بە پێغەمبەر (ﷺ) وت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کچە ئازیزەکەم ئایا ئەو ئافرەتەت خۆش ناوێت کە من خۆشم دەوێت؟) فاطیمە وتی با، گەڕایەوەو هەواڵەکەی دایەوە بە هاوسەرەکانی تری، ئینجا بڕیاریان دا زەینەبی کچی جەحش بنێرن، زەینەب چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتووڕە بوو و وتی ژنەکانت دەڵێن بۆ خاتری خوا بەرامبەر بە خۆشەویستیت بۆ عائیشە دادپەروەر بە، هێندە دەنگی بەرز کردەوە تا کار گەیشتە ئەوەی قسەیەکی وت بە عائیشە، عائیشەش لەولاوە دانیشتبوو، پێغەمبەر (ﷺ) تەماشایەکی عائیشەی کرد وەك پێی بفەرموێت قسەت نیە؟ عائیشەش کەوتە وەڵامدانەوەی زەینەب تا بێدەنگی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) تەماشایەکی عائیشەی کرد و فەرمووی: ئەوە کچی ئەبووبەکرە.[٨٢٣٤]

عائیشە پەیامی فاطیمە دەگەیەنێت:

جارێك فاطیمە لای باوکی سکاڵای کرد کە لەدەست کارو هەویر شێلان چی بە دەستەکانی هاتووە، ئەوەبوو پاش ماوەیەك بڕێ دیل هێنران کە ئافرەتیشی تێدا بوو، فاطیمە چوو تا داوای خزمەتکارێك بکات، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) لەوێ نەبوو، بۆیە باسی حاڵی خۆی بۆ عائیشە کرد و پێی وت بۆچی هاتووەو بە عائیشەی وت تا بە پێغەمبەر (ﷺ) بڵێت، کە پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە، عائیشە پێی وت فاطیمە بۆ شتێکی لەو جۆرە هاتووە، پێغەمبەریش (ﷺ) چوو بۆ ماڵەوەو عەلی و فاطیمەش لە جێگەدا بوون، ویستیان هەستن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی لە شوێنی خۆتاندا بن، ئینجا هات و لەلایان دانیشت، فەرمووی (ألا أدلكما على خير مما سألتما، إذا أخذتما مضاجعكما فسبحا ثلاثا

[٨٢٣٣] - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٧٥٥.

٨٢٣٤ - صحيح البخاري، الرقم ٢٤٦٢.

وثلاثين، واحمدا ثلاثا وثلاثين، وكبرا أربعا وثلاثين، فهو خير لكما من خادم)،[٨٢٣٥] (ئايا شتێكی باشتر لەوەتان پێ نیشان نەدەم كە داواتان كردبوون، كە چوونە ناو جێگەكەتان سی و سێ جار سوبحانەڵا و سی و سێ جار الحمد لله و سی و چوار جار الله أكبر بكەن، ئەوە زۆر بۆتان باشترە لە خزمەتكارێك).

عائیشە شایەتی پاكی دەدات بۆ عەلی و فاطیمە و حەسەن و حوسەین:

عائیشەی دایكی باوەڕداران دەڵێت: بەیانیەك پێغەمبەر (ﷺ) چوویە دەرەوەو جلێكی خوری لەبەر بوو كە لە مووی ڕەش دروستكرابوو، ئینجا حەسەنی كوڕی عەلی هات و پێغەمبەر (ﷺ) هێنایە ژوورەوە، دوای ماوەیەكی تر حوسەین هات و لەگەڵی هاتە ژوورەوە، دواتر فاطیمە هات و پێغەمبەر (ﷺ) ئەویشی هێنایەژوورەوە، ئینجا عەلیش هات و پێغەمبەر (ﷺ) ئەویشی هێنایە ژوورەوە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە (إنما يريد الله ليذهب عنكم الرجس أهل البيت و يطهركم تطهيرا).[٨٢٣٦]

عائیشە شایەتی بۆ ڕێزداری فاطیمە دەدات:

عائیشەی دایكی باوەڕداران دەڵێت: هیچ كەسم نەدیوە هێندەی فاطیمە هەڵسوكەوت و قسەكردنی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بچێت، هەركات فاطیمە دەچوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەری هەڵدەسا و ماچی دەكرد و بەخێرهاتنی دەكرد و دەستی دەگرت و لە پاڵ خۆیدا دایدەنیشاند، هەركاتیش پێغەمبەری خوا (ﷺ) بچوایە بۆ لای فاطیمە، فاطیمە لەبەری هەڵدەسا و ماچی دەكرد و دەستی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەگرت و ماچی دەكرد.[٨٢٣٧]

عائیشە شایەتی دەدات فاطیمە گەورەی ژنانی بەهەشتە:

عائیشە دەڵێت فاطیمە هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) كە دەچوو بەڕێدا دەتوت هەمان ڕێكردنی پێغەمبەرە(ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی مەرحەبا لە كچەكەم، ئینجا لای خۆیەوە داینیشاند، دواتر چپەیەكی بۆ كرد و فاطیمە گریا، وتم بۆچی دەگریت؟ دواتر پێغەمبەر (ﷺ) چپەیەكی تری بۆ كرد و

---

٨٢٣٥ - صحيح البخاري، الرقم ٢٩٦٢، صحيح مسلم، الرقم ٥٠١٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٥٦٠١، سنن أبي داود، الرقم ٤٤٢٤.

٨٢٣٦ - صحيح مسلم، الرقم ٤٥٥٤، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣١٤٦٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٢٦٦٢،

٨٢٣٧ - سنن أبي داود، الرقم ٤٥٦١، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٧٧٨٤، صحيح ابن حبان، الرقم٧٠٦٣، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٨٩ وقال حسن صحيح، صححه الذهبي في التلخيص، كما صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٥٢١٧.

فاطیمه دەستی کرد بە پێکەنین، منیش وتم تا ئێستا نەمدیوە خەم و خۆشی ئاوا لەیەك نزیك بن، وتم چۆن بوو واگریایت و دواتر پکەنیت؟ فاطیمەش وتی نهێنی پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکرا ناکەم، دواتر کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، چووم هەمان پرسیارم لێکردەوە، ئەویش وتی چپاندی بە گوێمدا (جیبریل هەموو ساڵێك یەك جار قورئانی لەگەڵ دەور دەکردمەوە، ئەمساڵ دوو جار لەگەڵم دەوری کردەوە، وادەزانم ئەمە ئاماژەی مەرگمە، تۆیش یەکەم کەسیت بە من دەگەیتەوە)، منیش دەستم کرد بە گریان، دواتر فەرمووی(ئایا رازی نابیت تۆ گەورەی ژنانی بەهەشت –یان گەورەی ژنانی باوەڕداران– بیت؟) منیش بەوە پێکەنیم.[٨٢٣٨]

عەلی شایەتی دەدات عائیشە هاوسەری هەردوو دنیای پێغەمبەرە(ﷺ):

پاش ئەوەی جەنگی جەمەل روویدا و سوپای عائیشە شکستی خوارد، عەلی هات بۆ لای عائیشە وتی دایەگیان چۆنیت؟ وتی باشم، عەلی وتی خوا لێت خۆش بێت، ئینجا یەك یەك سەرکردەو کەسایەتیەکان دەهاتن سەلامیان دەکرد لە عائیشە، دواتر کە شەو داهات عائیشە هاودەم بە موحەممەدی برای چوونەوە بەصرە، ئینجا عەلی پاش سێ رۆژ فەرمانی کرد چی کەلوپەلێ گیراوە ببرێتە بەصرەو هەوادارانی عائیشە بێن چییان هەبووە ببەنەوە، خەڵکێ گلەییان کرد کە بۆچی خوێنیان رەوا بێت کە چی سامانیان رەوا نەبێت، با ببەین، عەلیش بە تووڕەییەوە وەك تانەیەك بۆیان وتی کامتان پێی خۆشە دایکی باوەڕداران ببات بۆ خۆی؟ هەمووان بێدەنگ بوون، دواتر عائیشە بڕیاری دا بەصرە جێبهێڵێت، عەلی هەموو پێداویستیەکی بۆ ئامادە کرد و مۆڵەتی دا هەرکەسیش لە سوپاکەی رزگار بووە لەگەڵی بگەڕێتەوە، ئینجا چل ئافرەتی بەصرەی هەڵبژارد تا لەگەڵ عائیشە بچنەوە، موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکریشی لەگەڵ ناردەوە، ئەو رۆژەی بڕیار بوو عائیشە بڕوات، عەلی هاتە بەردەگاو عائیشەش بە کەژاوەکەوە هێنرایە دەرەوەو ماڵئاوایی لە خەڵك دەکرد، عائیشە وتی کوڕە شیرینەکانم، کەستان لەسەر ئەم بارە سەرکۆنەمان نەکات، بەخوا نێوانی من و عەلی تەنها وەك ئافرەت و پارێزەرانی وایە و ئەو لای من لە کەسە هەرە چاکەکانە، عەلیش وتی بەخوا راست دەکات نێوانمان وایە و ئەو هاوسەری پێغەمبەرەکەتانە لە دنیا و ئاخیرەتدا، ئینجا عەلی چەند کیلۆمەترێك لەگەڵ

[٨٢٣٨] - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٤٦.

عائیشه چوو و بەڕێی کرد، عائیشەش چوو بەرەو مەککەو لەوێ حەجی ئەو ساڵەی کرد و دواتر گەڕایەوە بۆ مەدینە.[8239]

عائیشه شوێنی گۆڕی خۆی دەدات بە حەسەنی کوڕی عەلی:

حەسەنی کوڕی عەلی لە سەرەمەرگیدا حوسەینی برای بانگ کرد و وەسیەتی بۆ کرد، تیایدا وتی : من داوام لە عائیشه کردووە ئەگەر مردم مۆڵەتم بدات لە ماڵەکەی ئەودا لەلای پێغەمبەر (ﷺ) ئەسپەردە بکرێم، ئەویش رازی بووە، دەڵێم لەوانەیە لە شەرمدا وتبێتی بەڵێ و رازی نەبووبێت، بۆیە ئەگەر مردم بڕۆ بۆ لای و داوای هەمان شتی لێ بکەرەوە، ئەگەر پێی خۆش بوو ئەوە لە ماڵەکەی ئەودا ئەسپەردەم بکە.[8240]

کاتێك حەسەنی کوڕی عەلی وەفاتی کرد، لەسەر وەسیەتی خۆی حوسەینی برای چوو بۆ لای عائیشەو داوای لێکردەوە کە حەسەنی برای لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەسپەردە بکرێت، ئەویش رازی بوو و وتی باشە، بەڵام مەڕوان رێی نەدا و لە بەقیع ئەسپەردە کرا.[8241]

عائیشه لەسەر حوسەین ئامۆژگاری موعاویە دەکات:

کاتێك موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان بەیعەتی بۆ یەزیدی کوڕی وەرگرت، حوسەینی کوڕی عەلی و چەندێکی دی نارازی بوون، جا عائیشه وای بیست کە موعاویە هەڕەشەی لەوانە کردووە ئەگەر بەیعەت نەدەن دەیانکوژێت، بۆیە عائیشه ئامۆژگاری موعاویەی کرد و پێی وت بیستوومە هەڕەشەی کوشتنت لەوانە کردووە! موعاویە وتی ئەی دایکی باوەڕداران ئەوانە زۆر لەوە شکۆدارترن کە هەڕەشەی کوشتنیان لێ بکەم، بەڵام من بەیعەتم بۆ یەزید وەرگرتووەو خەڵکی جگە لەوان بەیعەتیان داوە، جا رات وایە دوای ئەو هەمووە بەیعەتەکەی لەکار بخەم؟ عائیشه وتی دەی بەرامبەریان نەرمونیان بە، ئەگەر خوا بیەوێت دێنە سەر راکەت، موعاویەش وتی وادەکەم.[8242]

---

٨٢٣٩ - البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٤٠٢٤٧.

٨٢٤٠ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩١-٣٩٢.

٨٢٤١ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩٢.

٨٢٤٢ - الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٣٥٣.

## هیندی کچی ئەبی ئومەییە(ئوممسەلەمە) (دایکی باوەڕداران) (رضي الله عنها)

ناوی هیندی کچی  ئەبی ئومەییەیەو بە ئوممسەلەمە ناسراوە، باوکی بە زادورەکب ناسرابوو، چونکە زۆر بەخشندە و بەسەخاوەت بوو، دایکیشی ناوی عاتیکەی کچی عامیر بوو، ئەم هاوەڵە زۆر زوو

له مەككە هاودەم بە ئەبووسەلەمەی مێردی موسڵمان بوو و پێکەوە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، دواتر گەڕانەوە بۆ مەككەو لەوێوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە.[11595]

ئومموسەلەمە برایەکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئومەییەیە، عەبدوڵا سەرەتا نەیارێکی سەرسەختی موسڵمانان بوو، تا فەتحی مەككە کرا، ئەوکات کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ فەتحی مەككە بەڕێوەبوو، عەبدوڵا هاودەم بە ئەبووسوفیان بەرەو مەدینە چوون و لەرێدا گەیشتن بە پێغەمبەر (ﷺ)، داوایان کرد بچن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) رازی نەبوو، دواتر ئوممسەلەمە سەبارەت بەوان قسەی کرد لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) و دواجار پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتی دا بێنەژوورەوە، ئەوانیش هاتنە ژوورەوەو موسڵمان بوون، موسڵمانبوونەکەشیان دروست بوو و عەبدوڵا بۆ فەتحی مەككە لەناو سوپای موسڵماناندا مایەوەو دواتریش بەشداری هەریەك لە غەزاکانی حونەین و طائیفی کرد، لەو غەزایەدا تیرێکی بەرکەوت و کوشتی.[11596]

ئوممسەلەمە کوڕێکی هەبوو بەناوی سەلەمەی کوڕی ئەبی سەلەمە، دوای وەفاتی باوکی و شووکردنی دایکی بە پێغەمبەر (ﷺ)، لە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) گەورە بوو و مایەوە، پێغەمبەر (ﷺ) ئومامەی کچی حەمزەی مارە کرد لە سەلەمە، هەردووکیان تازەپێگەیشتووبوون، بەڵام هێندەی نەبرد ئومامە کۆچی دوایی کرد، سەلەمە پاش وەفاتی پێغەمبەریش (ﷺ) ژیا و لە سەردەمی ئومەویەکاندا کۆچی دوایی کرد.[11597]

کوڕێکی تری ناوی عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە بوو، لە ساڵی دووی کۆچی لە حەبەشە لەدایك بوو، ئەم هاوەڵە دواتر هاتە مەدینە و لەوێ ژیا تا لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا لەناو سوپای عەلیدا بەشداری جەنگی جەمەلی کرد و دواتر لە ساڵی هەشتاو سێی کۆچیدا هەر لە مەدینە وەفاتی کرد،[11598] عومەر دەڵێت رۆژێك لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) خواردنێکم دەخوارد، خەریك بووم لە بەشەکانی قاپەکەوە دەمخوارد، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووم(لەبەر خۆتەوە بخۆ)،[11599] لە

---

١١٥٩٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص١٥٠.

١١٥٩٦ - أسد الغابة، ج٣، ص ١٧٧.

١١٥٩٧ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص١٤٩.

١١٥٩٨ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٥٩٢.

١١٥٩٩ - صحيح البخاري، الرقم ٥٠٦٧.

گێڕانەوەیەکی تردا روونتر هاتووەو دەڵێت فەرمووی (ناوی خوا بێنەو بە دەستی راستت بخۆ و لەبەر خۆتەوە بخۆ).[١١٦٠٠]

هەروەها ئوممو‌سەلەمە کچێکیشی هەبوو بە ناوی زەینەب کە کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئوممو‌سەلەمەی بەهاوسەر گرت هێشتا زەینەب لە شیر نەبڕابوویەوە.[١١٦٠١]

ئوممو‌سەلەمە بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ ئەبووسەلەمە دەگێڕێتەوەو دەڵێت جارێك بە ئەبووسەلەمەم وت بیستوومە ئافرەت کە مێردەکەی مرد و لە دەستەی بەهەشتیەکان بوو و ئافرەتەکەش بەهەشتی بوو و شووی نەکردەوە، خوا لە بەهەشتدا کۆیان دەکاتەوە، بۆ پیاویش هەروا، دەی وەرە با من بەڵێنت پێ بدەم دوای تۆ شوو نەکەم و تۆیش دوای من ژن نەهێنیت، ئەبووسەلەمە وتی گوێڕایەڵم دەبیت؟ منیش وتم فەرمان بکە تا گوێڕایەڵت بم، عەبدوڵا وتی ئەگەر من مردم شوو بکە، دواتر وتی خوایە دوای من پیاوێکی باشتر ببەخشە بە ئوممو‌سەلەمە کە دڵتەنگ و نارەحەتی نەکات، ئەوەبوو کە ئەبووسەلەمە مرد، پێغەمبەر (ﷺ) داوای ئوممو‌سەلەمەی کرد.[١١٦٠٢]

ئەبووسەلەمەی مێردی یەکێك بوو لەبەشداربوانی غەزای بەدر، دواتریش لە غەزای ئوحوددا بەشداری کردو لە ئوحوددا بریندار بوو،[١١٦٠٣] نزیکەی مانگێك برینێچی ئەو برینەی دەکرا تا باش بوو،[١١٦٠٤] پاش ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) لە مانگی صەفەردا ئەبووسەلەمەی کرد بە ئەمیری سریەیەك بۆ سەر بەنی ئەسەد، کاتێك لەو سریەیە گەڕایەوە برینەکەی جەنگی ئوحودی تەقی و لە مانگی جومادیلئاخیرەدا بەو هۆیەوە وەفاتی کرد.[١١٦٠٥]

دوای وەفاتی ئەبووسەلەمە، ئەبووبەکر داوای ئوممو‌سەلەمەی کرد، بەڵام شووی پێ نەکرد، ئینجا عومەر داوای کرد و شووی بەویش نەکرد، دواتر پێغەمبەر (ﷺ) داوای کرد و شووی کرد بە پێغەمبەر (ﷺ).[١١٦٠٦]

---

١١٦٠٠ - صحيح مسلم، الرقم ٣٨٦٠.

١١٦٠١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٧٥.

١١٦٠٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٨٨.

١١٦٠٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٥٤.

١١٦٠٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٨٧.

١١٦٠٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٥٤.

١١٦٠٦ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٠٣.

ئوممووسەلەمە دەڵێت کە ئەبووسەلەمە مرد وتم دەبێت چ کەسێك هەبێت لە ئەبووسەلەمە باشتر بێت؟ یەکەم ماڵ بوو لەبەر خوا کۆچی کرد، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) حاطیبی کوڕی ئەبی بەلتەعەی نارد تا داوام بکات بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) منیش وتم من منداڵم هەیەو ئافرەتێکیشم غیرەم زۆرە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بۆ مناڵەکەی داوا لە خوا دەکەین خوا موحتاجی دەستی دایکی نەکات و داواش لە خوا دەکەم غیرەکەی لاببات.[11607]

پێغەمبەر (ﷺ) لە ساڵی چوارەمی کۆچیدا گواستیەوە، ئەوکات ئافرەتێکی زۆر جوان بوو.[11608]

ئوممووسەلەمە دەڵێت –کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ویستی بمگوازێتەوە– فەرمووی ئەمشەو دێم بۆ لاتان، منیش بڕێك گەنمم لا هەبوو لەگەڵ بڕێك چەوریدا خواردنێکم بۆ ئامادە کرد، پێغەمبەر (ﷺ) شەو هات بۆ لام.[11609]

ئوممووسەلەمە دەڵێت کە پێغەمبەر (ﷺ) منی گواستەوە پێی فەرمووم ئەگەر بتەوێت حەوت شەو لات دەمێنمەوە، بەلام ئەگەر حەوت شەو لات بمێنمەوە ئەوە بۆ ژنەکانی تریشم حەوت شەو دەمێنمەوە،[11610] ئەوەبوو ئوممووسەلەمە سێ شەوی هەڵبژارد.[11611]

ئوممووسەلەمە دەڵێت وتم ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئایا ئەگەر یارمەتی و بەخشش بدەم بە منداڵەکانی ئەبووسەلەمە خێرم دەگات؟ چونکە ئەوانە منداڵی منیشن، فەرمووی (پێیان ببەخشە، لەسەر بەخششت بۆیان پاداشتت بۆ هەیە).[11612]

ئوممووسەلەمە دەڵێت جارێك پێغەمبەر (ﷺ) سوێندی خوارد یەك مانگ نەچێت بە لای ژنەکانیدا، بیست و نۆ رۆژ تەواو بوو ئیتر دەچوو بۆ لای ژنەکانی، خەڵکی وتیان تۆ سوێندت خوارد مانگێك نەچیت بەلایاندا، ئەویش فەرمووی (مانگ هەیە بیست و نۆ رۆژە).[11613]

---

١١٦٠٧ - صحيح مسلم، الرقم ١٥٧٦.

١١٦٠٨ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٠٢.

١١٦٠٩ - صحيح ابن حبان، الرقم ٤١٢٨، حسنه شعيب الأرناؤوط.

١١٦١٠ - صحيح مسلم، الرقم ٢٧٢٨.

١١٦١١ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٠٥.

١١٦١٢ - صحيح البخاري، الرقم ١٤٠٩.

١١٦١٣ - صحيح البخاري، الرقم ١٨٢٤.

جارێك جیبریل له‌ شێوه‌ی دیحیه‌ی كه‌لبیدا هات بۆ لای پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) كه‌ لای ئوممو‌سه‌له‌مه‌ بوو، له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) قسه‌ی كرد و دواتر چوو، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به‌ ئوممو‌سه‌له‌مه‌ی فه‌رمو‌و ئه‌وه‌ كێ بوو؟ وتی ئه‌وه‌ دیحیه‌ بوو، دوای ماوه‌یه‌ك پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له‌ وتاردا باسی كرد كه‌ جیبریل هاتووه‌ بۆ لای ئینجا زانی كه‌ ئه‌وه‌ دیحیه‌ نه‌بووه‌و جیبریل بووه‌.[١١٦١٤]

ده‌سته‌یه‌ك له‌ ژنانی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) كه‌ هاورای ئوممو‌سه‌له‌مه‌ بوون، به‌ ئوممو‌سه‌له‌مه‌یان وت له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) قسه‌ بكه‌ تا به‌ خه‌ڵكه‌كه‌ بڵێت هه‌ركه‌س ده‌یه‌وێت دیاری بۆ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)با له‌ ماڵی هه‌ر ژنێكی بێت بۆی ببات، ئوممو‌سه‌له‌مه‌ش چوو ئه‌وه‌ی وت به‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) وه‌ڵامی نه‌دایه‌وه‌، جارێكی تر ژنه‌كانی تری ئوممو‌سه‌له‌مه‌یان بۆ هه‌مان مه‌به‌ست نارده‌وه‌و پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) وه‌ڵامی نه‌دایه‌وه‌، له‌ جاری سێیه‌مدا پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی (لا تؤذيني في عائشة فإن الوحي لم يأتني وأنا في ثوب امرأة إلا عائشة)،[١١٦١٥] (سه‌باره‌ت به‌ عائیشه‌ ئازارم مه‌ده‌، چونكه‌ هیچ كات له‌ژێر یه‌ك جل له‌گه‌ڵ ئافره‌تێك بوویم سروشم بۆ نه‌هاتووه‌ مه‌گه‌ر له‌گه‌ڵ عائیشه‌).

ئوممو‌سه‌له‌مه‌ له‌ غه‌زای ته‌بووكدا هاوده‌م به‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به‌شدار بوو، ئه‌وه‌تا عیرباضی كوڕی ساریه‌ ده‌ڵێت من هه‌موو كات له‌به‌ر ده‌رگای ماڵی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ده‌بووم هه‌م له‌ ماڵه‌وه‌و هه‌م له‌ سه‌فه‌ریش، شه‌وی ته‌بووك پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ویستی بچێته‌ ناو خێوه‌ته‌كه‌ی و ئوممو‌سه‌له‌مه‌ی خێزانیشی له‌گه‌ڵدا بوو، من بۆ پێویستیه‌ك چووبووم و هاتمه‌وه‌.[١١٦١٦]

ئه‌بوو مووسا ده‌ڵێت من لای پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) بووم كه‌ له‌ جه‌عرانه‌ له‌ نێوان مه‌ككه‌و مه‌دینه‌ لایدابوو، بیلالیش له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) بوو، ئه‌عرابیه‌ك هات بۆ لای پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) و وتی ئه‌و به‌ڵێنه‌ی پێت دام بۆم نایه‌نیته‌دی؟ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی (موژده‌ت لێ بێت)، كابرا وتی موژده‌ی زۆرت پێداوم، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) وه‌ك تووڕه‌ییه‌كی هه‌بێت ته‌ماشای ئه‌بووموسا وبیلالی كرد و فه‌رمووی (كابرا موژده‌كه‌ی به‌رپه‌رچ دایه‌وه‌، ئێوه‌ وه‌رن)، ئێمه‌ش چووین، داوای قاپێ ئاوی كرد و ده‌ست و ده‌موچاوی تێدا شۆرد و ئاوی رادایه‌ ده‌می و كردیه‌وه‌ ناوی و دواتر فه‌رمووی (لێی بخۆنه‌وه‌ و بیكه‌ن

---

١١٦١٤ - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٥٥.

١١٦١٥ - صحيح البخاري، الرقم ٢٤٦٢، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٩٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٦٢٤، قال الذهبي في سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٤٣ متفق على صحته.

١١٦١٦ - دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٤٣٤، تاريخ دمشق لابن عساكر، ج٤٠، ص ١٨٩، البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ١١٨.

بەسەر دەموچاوو و گەردنتاندا و موژدەتان لێ بێت)، ئێمەش وامانکرد، پاشان فەرمووی زیادەکەی لێ بهێڵنەوە بۆ دایکتان، ئوممووسەلەمەی لە پشت پەردەوە بانگ کرد، ئێمەش زیادەکەیمان بۆ هێشتەوە.[11617]

ئوممووسەلەمە کۆتا خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە وەفاتی کرد، هێندە ژیا تا شەهیدبوونی حوسەینی کوڕی عەلی بیست و دڵتەنگیەکی زۆر دایگرت، کەمێك پاش ئەو رووداوە وەفاتی کرد، تەمەنی نزیکەی نەوەد ساڵ دەبوو،[11618] تەرمەکەشی لە بەقیع ئەسپەردە کرا،[11619] مردنەکەشی لە ساڵی شەست و یەکی کۆچیدا بوو، ئەو رایەش دەڵێت لە ساڵی پەنجا و نۆی کۆچیدا وەفاتی کردووە راست نیە.[11620]

ئوممووسەلەمە یەکێك بوو لە ئافرەتە زاناکانی ناو هاوەڵان.[11621]

---

١١٦٢١ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٠٣.

١١٦٢٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٢٨.

١١٦٢٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص١٤٩.

# مەیموونەی کچی حارث(دایکی باوەڕداران) (رضي الله عنها)

ناوی مەیموونەی کچی حارثی کوڕی حەزەنی هیلالیە، سەرەتا ناوی بەڕە بوو و پێغەمبەر (ﷺ) ناوی گۆڕی و ناوی نا مەیموونە، پێشتر هاوسەری ئەبی روهمی کوڕی عەبدولعوززا بوو، پێغەمبەر (ﷺ) لە مانگی ذیلقەعیدەی ساڵی حەوتی کۆچی و لە عومرەی دوای حودەیبیەدا بەهاوسەری گرت، جا دەوترێت پێغەمبەر (ﷺ) جەعفەری ئامۆزای ناردووە بۆ داوای و ئەویش مۆڵەتی لە عەبباس خواستووەو عەبباسیش مارەی کردووە لە پێغەمبەر (ﷺ)، دەشوترێت بەڵکو عەبباس وەسفی مەیموونەی کرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دوای ئەوەی مێردەکەی وەفاتی کردبوو، رایەکیش دەڵێت بەڵکو مەیموونە خۆی پێشنیازی هاوسەرگیری کرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ).[11034]

پێغەمبەر (ﷺ) پێش دەرچوونی لە مەدینەوە بۆ مەککە بە نیازی عومرە، هەریەك لە ئەبوو رافعو ئەوسی کوڕی خەولی نارد بۆ لای عەبباس تا داوای مەیمونەی بۆ بکەن، عەبباسیش رازی بوو مەیموونە بدات بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەو دوو هاوەڵەش گەڕانەوە بەڵام وشترەکانیان ون بوون، بۆیە چەند رۆژێك لە (بطن رابغ) مانەوە تا پێغەمبەر (ﷺ) لە ناوچەی (قديد) گەیشت پێیان کە وشترەکانیان دۆزیبوونەوە، ئیتر لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) چوون بۆ مەککە.[11035]

---

١١٠٣٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ١٢٦-١٢٨.

١١٠٣٥ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص١٣٢، الإصابة في تميز الصحابة، ج٨، ص١٢٧.

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ عومرەی پاش حودەیبیە جەعفەریشی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەر (ﷺ) جەعفەری نارد بۆ داوای مەیموونەی کچی حارث، مەیموونەش مەسەلەکەی دایە دەست عەبباس کە مێردی خوشکەکەی بوو، عەبباسیش مەیموونەی لە پێغەمبەر (ﷺ) مارە کرد.[١١٠٣٦]

کاتێك زیادی کوڕی عەبدوڵا کە خوشکەزای دایکی باوەڕداران مەیموونەی کچی حارث بوو، هات بەرەو مەدینەو گەیشتە ئەوێ، راستەوخۆ چوو بۆ ماڵی دایکی باوەڕداران مەیموونەی پووری، ئەوکات زیاد لە تەمەنی گەنجیدا بوو، لەوێ لای دایکی باوەڕداران مایەوە، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ ئەوێ و زیادی بینی تووڕە بوو و گەڕایەوە، خێرا مەیموونە وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە خوشکەزامە، پێغەمبەریش (ﷺ) چوویە ژوورەوە، دواتر پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ مزگەوت، زیادیش لەگەڵیدا چوو، نوێژی نیوەڕۆی کرد، زیادی لە خۆی نزیك کردەوەو دەستی هێنا بەسەر سەریدا و دواتر دەستی هێنا بەسەر لووتیدا.[١١٠٣٧]

ئیبن عەبباس دەڵێت شەوێك لە ماڵی مەیموونەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) مامەوە کە پوورم بوو، راکشام و پێغەمبەریش (ﷺ) راکشا، لە نیوەی شەودا لە خەو هەستاو بە دەستەکانی خەوی لە چاوانی دەتۆراند، دواتر دە ئایەتی کۆتای سورەتی ئالی عیمرانی خوێند، دواتر هەستاو دەستنوێژی گرت و دەستی کرد بە نوێژ کردن، منیش هەمان چەشنی ئەوم کرد، دواتر لە کەناریەوە وەستام، دەستی راستی خستە سەر سەرم و بە دەستی گوێی راستی گرتم و دەیپرواند، دوانزە رکات نوێژی کرد، دواتر یەك رکاتی کرد، ئینجا راکشا تا بانگبێژ هات، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) هەستا و دوو رکاتی کورت نوێژی کرد، ئینجا نوێژی بەیانی کرد.[١١٠٣٨]

مەیموونە دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) لەلای من گۆشتی باڵی ئاژەڵی خوارد و دواتر بێ ئەوەی دەستنوێژی نوێ بکاتەوە نوێژی کرد.[١١٠٣٩]

مەیموونە دەڵێت جێی خەوی من لەپاڵ شوێنی نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، جار هەبوو جلەکەی دەکەوت بە سەرمدا و منیش لەناو جێگەکەمدا بووم.[١١٠٤٠]

---

١١٠٣٦ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٢٩.

١١٠٣٧ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣١٠.

١١٠٣٨ - صحيح البخاري، الرقم ١١٥٥، صحيح مسلم، الرقم ١٣١٥.

١١٠٣٩ - صحيح البخاري، الرقم ٢٠٦.

مەیموونە دەڵێت لە ڕۆژی عەرەفەدا خەڵکی گومانیان هەبوو لە ڕۆژووی پێغەمبەر (ﷺ)، منیش بڕێك شیرم بۆ نارد ئەوکات لە عەرەفە وەستابوو، پێغەمبەر (ﷺ) لە شیرەکەی خواردەوەو خەڵکیش تەماشایان دەکرد.[١١٠٤١]

مەیموونە پاش وەفاتی پێغەمبەریش (ﷺ) ژیا و دواجار لە ساڵی چل و نۆ یان پەنجاو یەك یان شەست و سێ یان شەست و شەشی کۆچیدا وەفاتی کرد، بەڵام ڕاستتر ئەوەیە لە ساڵی پەنجاو یەکی کۆچیدا وەفاتی کرد.[١١٠٤٢]

---

١١٠٤٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ١٢٨.

١١٠٤٣ - شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٦٤٣٤.

١١٠٤٤ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٠٩٦٩، الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ٣٠٣٣.

١١٠٤٥ - سنن أبي داود، الرقم ١٨١٢، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٣٣١٤.

## صەفییەی کچی حویەی (دایکی باوەڕداران)(رضي الله عنها)

ناوی صەفییەی کچی حویەی کوڕی ئەخطەبە، هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) و دایکی باوەڕدارانە.

صەفییەی ئافرەتێکی جوولەکە بوو و هاوسەری سەللامی کوڕی میشکەم بوو، دواتر شووی کرد بە کینانەی کوڕی ئەبیلحوقەیق، بەڵام کینانە لەغەزای خەیبەردا کوژرا.[7751]

صەفییە هاودەم بە کچە ئامۆزایەکی بەدیل گیران و بیلال ئەوانی دەهێنا، ئەوانی برد بە لای کوژراوانی جوولەکەدا، ئامۆزاکەی صەفییە کە ئەوەی بینی دەستی کرد بە قیژو قاو و خۆڵی دەکرد بەسەر سەریدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەو شەیتانەم لەبەرچاو لابەن)، بەڵام فەرمانی کرد بە دوایدا صەفییە برا، خەڵکی زانییان کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، پێغەمبەر (ﷺ) بە بیلالی فەرموو (ئەی بیلال مەگەر سۆزت لێ داماڵرابوو وا ئەو دوو ژنەت برد بە لای کوژراوەکانیاندا؟!).[7752]

کاتێك خەیبەر فەتح کراو کەنیزەکەکانیش کۆکرانەوە، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەستکەوتەکانی دابەش دەکرد، دیحیەی کوڕی خەلیفە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەنیزەکێکم پێ ببەخشە، ئەویش فەرمووی (برۆ کەنیزەکێك ببە)، دیحیەش چوو صەفییەی کچی حویەی برد کەسێك هات وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن کچی سەرۆك هۆزەکە دەدەیت بە دیحیە، دەبێت بۆ تۆ بێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای کرد دیحیە هاودەم بە صەفییە بێت، ئەویش هات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی لە بری صەفییە کەنیزەکێکی تر هەڵبژێرە، دیحیەش وایکرد و پێغەمبەر (ﷺ) صەفییەی ئازاد کرد و مارەی کرد.[7753]

صەفییە پێشتر خەوی دیبوو کە مانگ کەوتبوویە ژوورەکەیەوە، ئەوەی بۆ دایکی باسکرد، دایکیشی زللەیەکی دا لە دەموچاوی و وتی تۆ گەردنت درێژ دەبێت تا دەچیتە لای پاشای عەرەب، ئیتر ئەو شوێن زللەی پێوە دیار بوو تا هاتە لای پێغەمبەریش (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لێکرد بۆ دەموچاوی وایە، ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد.[7754]

کاتێك صەفییە هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی باوکت بەردەوام لە سەرسەختترینی جوولەکە بوو بەرامبەرم تا خوا کوشتی، صەفییە وتی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) خوای

---

٧٧٥١ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٨٤.

٧٧٥٢ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٨٤.

٧٧٥٣ - صحيح البخاري، الرقم ٣٦٧، صحيح مسلم، الرقم ٢٦٣٩.

٧٧٥٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٧٣٩.

گەورە لە کتێبەکەیدا فەرموویەتی (ولا تزر وازرة وزر أخرى)، کەس باجی تاوانی کەس نادات، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: هەڵبژێرە، ئەگەر ئیسلام هەڵدەبژێریت ئەوە بۆ خۆم دەتهێڵمەوە، ئەگەریش جوولەکایەتی هەڵدەبژێریت ئەوە لەوانەیە ئازادت بکەم و بچیتەوە بۆ لای کەسوکارت، صەفییە وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەخوا تاسەی ئیسلامم کردووەو پێش ئەوەی بانگم بکەیت کە هاتم بۆ لات بڕوام بە تۆ هێنا، هەروەها من لەناو جوولەکایەتیدا هیچ باوك و برایەکم نیە، تۆ منت لەنێوان کوفر و ئیسلامدا سەرپشك کرد، جا خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە ئازادبوونم و گەڕانەوەم بۆ لای هۆزەکەم لام خۆشترن، پێغەمبەریش (ﷺ) هێشتیەوە بۆ خۆی.[7755]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە خەیبەر صەفییەی بۆ خۆی هەڵبژارد، لەگەڵ خۆی بردی تا لە سەددورەوحاء وەستا و لەوێ گواستیەوە، پاشان بڕێ خواردنی شیر و خورمای لە پارچە پێستەیەکدا ئامادە کرد و پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەوانەی دەورت بانگ بکە، ئیتر ئەوە وەلیمەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو بۆ صەفییە، دواتر کە گەیشتنە مەدینە، پێغەمبەر (ﷺ) لای وشترەکەوە دانیشتبوو و ڕانی دانابوو، صەفییە قاچی خستە سەر ڕانی پێغەمبەر (ﷺ) تا سەرکەوت.[7756]

جارێك حەفصە بە صەفییەی وت تۆ کچە جوولەکەیت، پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ژوورەوەو صەفییە دەگریا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بۆچی دەگریت؟ صەفییە وتی حەفصە پێی وتووم کچە جوولەکەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بە دڵنیاییەوە تۆ کچە پێغەمبەریت و مامیشت پێغەمبەرەو ژنی پێغەمبەرێکیت، ئیتر ئەو بە چی بەرووتدا دەنازێت؟) پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (لەخوا بترسە ئەی حەفصە).[7757]

صەفییە ئافرەتێکی ژیرو جوان و ئایینداربوو.[7758]

جارێك پێغەمبەر (ﷺ) لە مزگەوت بوو و ژنەکانیشی لای بوون، دواتر ژنەکانی چوون، پێغەمبەر (ﷺ) بە صەفییەی فەرموو پەلە مەکە تا لەگەڵت بێم، ماڵی صەفییە لە ماڵی ئوسامە بوو، پێغەمبەر

---

٧٧٥٥ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٢٣.

٧٧٥٦ - صحيح البخاري، الرقم ٢١٤٢.

٧٧٥٧ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧٣١٨، سنن الترمذي، الرقم ٣٩١١ و قال حسن صحيح، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢١٤٩، صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٣٨٩٤.

٧٧٥٨ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٣٢.

(ﷺ) لەگەڵی چوویە دەرەوە، دوو کەس لە پشتیوانان پێی گەیشتن و تەماشای پێغەمبەری خوایان (ﷺ) کرد، دواتر تێپەڕ بوون، پێغەمبەر (ﷺ) بەو دوانەی فەرموو (وەرن، ئەمە صەفییەی کچی حویەیە)، ئەوانیش وتیان سوبحانەڵا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (إن الشيطان يجري من الإنسان مجرى الدم، وإني خشيت أن يلقي في أنفسكما شيئا)،[٧٧٥٩] (شەیتان بە دەمارەکانی خوێنی مرۆڤدا تێدەپەڕێت، منیش ترسام شتێك بخاتە ناختانەوە).

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش بوو و ژنەکانی لە دەوری کۆبوونەوە، صەفییە وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆزگە ئەو دەردەی بە تۆوەیە لە من کەوتایە، ژنەکانی تری بە زیتەی چاو سەیریان دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئاو لە دەم رادەن، وتیان لەبەر چی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی لەو چاو زیت کردنەوەتان لە هاوەڵەکەتان، بەخوا ئەو راستگۆیە.[٧٧٦٠]

جارێك ئافرەتێکی خزمەتکاری صەفییە چوو بۆ لای عومەری کوڕی خەططاب و وتی صەفییە رۆژانی شەممەی زۆر لا خۆشەویستەو سەردانی جوولەکەکانیش دەکات، عومەریش ناردی بە شوێنیدا و پرسیاری لێکرد، صەفییە وتی سەبارەت بە رۆژی شەممە، لەو کاتەوەی خوا رێنمونی کردوم خۆشەویستیم بۆی نیە، سەبارەت بە سەردانی جوولەکەش، ئەوە من خزم و کەسم هەیە لەنێویاندا، دواتر صەفییە بە کەنیزەکەی وت بۆچی واتکرد؟ وتی شەیتان پێی کردم، صەفییە وتی دەی برۆ ئیتر تۆ ئازادیت.[٧٧٦١]

صەفییە لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا پاڵپشتی عوثمان بوو، کاتێك گەمارۆی ماڵی عوثمان درا، صەفییە بە وڵاخێکەوە چوو تا بچێت بۆ لای عوثمان، کەچی ئەشتەر هاتە رێی و نەیهێشت، صەفییە وتی بمگێڕنەوە با ئەمە ئابڕووم نەبات، دواتر حەسەنی لەنێوان ماڵی خۆی و عوثماندا داناو خواردن و خواردنەوەی دەنارد بۆ عوثمان.[٧٧٦٢]

---

٧٧٥٩ - صحيح البخاري، الرقم ١٩٥٠،

٧٧٦٠ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٣١٣، حسنه ابن حجر في الإصابة، ج٧، ص ٧٤١.

٧٧٦١ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٣٣.

٧٧٦٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٧٤١.

سەبارەت بە کاتی وەفاتی صەفییە، دەوترێت لە ساڵی سی و شەشی کۆچی وەفاتی کردووە، ڕایەکیش دەڵێت لە ساڵی پەنجای کۆچیدا وەفاتی کردووە،[٧٧٦٣] ڕایەکیش دەڵێت لە سەردەمی خیلافەتی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان و لە ساڵی پەنجاو دووی کۆچیدا وەفاتی کردووە.[٧٧٦٤]

٧٧٦٣ -سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٣٥.

٧٧٦٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٧٤١.

## حەفصەی کچی عومەر(دایکی باوەڕداران) (رضی الله عنهما)

ناوی حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەططابی کوڕی نوفەیلە، دایکی ناوی زەینەبی کچی مەظعوونە.[4362]

خاڵۆی زەینەب ناوی عوثمانی کوڕی مەظعوون بوو کە یەکێك بوو لە گەورە هاوەڵان.[4363]

خاڵۆیەکی تری ناوی سائیب بوو کە ئەویش لە کۆچەرانی یەکەمی خاکی حەبەشە بوو، ئەویش گەڕایەوەو چوویە مەدینەو بەشداری بەدری کرد.[4364]

خاڵۆیەکی تری ناوی عەبدوڵا بوو کە ئەویش لەگەڵ دوو براکەی تری کۆچی کرد بۆ حەبەشە و گەڕایەوەو چوویە مەدینەو بەشداری غەزای بەدری کرد.[4365]

خاڵۆیەکی تری ناوی قودامە بوو کە ئەمیش هاوشێوەی براکانی تری کۆچی حەبەشەو غەزای بەدری بینی، دواتریش بەشداری هەموو غەزاکانی تریشی کردو دوای سەردەمی پێغەمبەریش (ﷺ) ژیا.[4366]

حەفصە برایەکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵای کوڕی عومەر کە یەکێکە لە هاوەڵە گەنج و زۆر ناسراوەکانی پێغەمبەر(ﷺ)،[4367] حەفصە شەش ساڵ لە عەبدوڵای برای گەورەتر بوو.[4368]

---

٤٣٦١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨١.

٤٣٦٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٨١.

٤٣٦٣ - أسد الغابة، ج٣، ص ٦٢٠.

٤٣٦٤ - أسد الغابة، ج٢، ص ٣٨٣.

٤٣٦٥ - أسد الغابة، ج٣، ص ٤٠٥.

٤٣٦٦ - أسد الغابة، ج٤، ص ٤١٧.

٤٣٦٧ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٨١.

٤٣٦٨ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٧.

برایەکی تری هەبوو بە ناوی زەید کە لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا لەدایك بوو.[٤٣٦٩]

برایەکی تری ناوی عەبدوڕەحمان بوو کە ئەمیش لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[٤٣٧٠]

برایەکی تری ناوی عاصم بوو کە لە کۆتاییەکانی سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لەدایك بوو و دایکی ناوی جەمیلە بوو.[٤٣٧١]

برایەکی تری ناوی عەبدوڕەحمان بوو کە ئەمەیان بە عەبدورەحمانی ناوەند ناسرابوو، واتە بچووکتر بوو لە عەبدوڕەحمانی برا گەورەی، ئەم برایەی لە سەردەمی خیلافەتی باوکیدا وەفاتی کرد.[٤٣٧٢]

برایەکی تری ناوی عوبەیدوڵا بوو کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لەدایك بوو و دایکی ناوی ئومموکلثومی کچی جەروەل بوو، عوبەیدوڵا لە سەردەمی خیلافەتی باوکیدا بەشداری جیهادی کرد.[٤٣٧٣]

حەفصە خوشکێکی هەبوو بە ناوی صەفییە و لە غەزای خەیبەردا بەشداری کرد،[٤٣٧٤] خوشکێکی تریشی هەبوو بە ناوی فاتیمە کە لە باوکیەوە خوشکی بوو.[٤٣٧٥]

کاتێك حەفصە لەدایك بوو هێشتا سەردەمی نەفامی بوو، ئەوکات قورەیشیەکان کەعبەیان بنیاد دەنایەوە، ئەمەش پێنجساڵ پێش ماوەی پێغەمبەرایەتی بوو.[٤٣٧٦]

حەفصە ژنی خونەیسی کوڕی حوذافەی سەهمی بوو، ئەم مێردەی زۆر زوو موسڵمان بووبوو، یەکێك بوو لە بەشداربوانی کۆچی حەبەشە، دواتر گەڕایەوەو چوو بۆ مەدینە، لەوێیش لە غەزاکانی بەدر و

---

٤٣٦٩ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٢٨.

٤٣٧٠ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٣٣٩.

٤٣٧١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص ٣.

٤٣٧٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص ٤٤.

٤٣٧٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص ٥٢.

٤٣٧٤ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٨٩.

٤٣٧٥ - موطأ مالك، الرقم ١٢٧٤.

٤٣٧٦ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٨١.

ئوحوددا بەشداری کرد، لە غەزای ئوحوددا خونەیس بریندار بوو و برینەکەی لێی قورس کرد و بەو هۆیەوە مرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) حەفصەی بەهاوسەر گرت.[٤٣٧٧]

کاتێك حەفصە بێوەژن کەوت، عومەری باوکی بڕیاری دا مێردێکی باش بدۆزێتەوە بۆ کچەکەی، بۆیە پێشنیازی کرد بۆ ئەبووبەکر تا بەهاوسەری بگرێت، بەڵام ئەبووبەکر ڕەزامەندی دەرنەبڕی، ئینجا پێشنیازی کرد بۆ عوثمان، ئەویش ڕەزامەندی دەرنەبڕی و وتی بڕوام نیە بتوانم ئەم ماوە ژن بهێنم، عومەریش بەوە دڵتەنگ بوو و جۆرێك لە بێتاقەتی ڕووی تێکرد و چوو لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵای کرد کە چی ڕوویداوە، ئەویش فەرمووی (یتزوج حفصة من هو خير من عثمان و يتزوج عثمان من هي خير من حفصة)، (کەسی باشتر لە عوثمان حەفصە بەهاوسەر دەگرێت و عوثمانیش کەسی باشتر لە حەفصە بەهاوسەر دەگرێت)، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) داوای حەفصەی کرد و بەهاوسەری گرت، دواتر کە ئەبووبەکر عومەری بینی وتی دڵت شتێك نەکات بەرامبەرم، من بیستبووم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی حەفصەی دەکرد، بۆیە –ئەمەشم پێ نەوتیت– وتم با نهێنی پێغەمبەر(ﷺ) ئاشکرا نەکەم، بە دڵنیاییشەوە پێغەمبەر(ﷺ) حەفصەی بەهاوسەر نەگرتایە من داوام دەکرد و بەهاوسەرم دەگرت.[٤٣٧٨]

## وەستانێك

بە چەند گێڕانەوەیەك هاتووە کە کاتێك ڕوقییەی کچی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد کە ژنی عوثمان بوو، عوثمان زۆر دڵگران بوو، بۆیە عومەر پێشنیازی بۆ کرد تا حەفصەی کچی بەهاوسەر بگرێت، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو،[٤٣٧٩] بەڵام دەزانین کاتێك غەزای بەدر ڕوویدا ڕوقییە نەخۆش بوو، بۆیە بە ویستی پێغەمبەر(ﷺ) عوثمان لای ڕوقییە مایەوە، بەڵام پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بگاتەوە ناو مەدینە ڕوقییە کۆچی دوایی کرد،[٤٣٨٠] هاوسەرگیری پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ حەفصەدا بەپێی بۆچوونی دروست لە ساڵی سێیەمی کۆچیدا بووە، چونکە خونەیسی مێردی حەفصە لە جەنگی ئوحوددا بریندار

---

٤٣٧٧ - أسد الغابة، ج٢، ص ١٨١.

٤٣٧٨ - صحيح البخاري، الرقم ٣٨٠٢، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٤٦٤٧، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٧، سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٨.

٤٣٧٩ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٨٢.

٤٣٨٠ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٢٦.

بوو و بەو هۆیەوە مرد،[٤٣٨١] تەنها لە گێڕانەوەیەکدا هێناویەتی کە خونەیس لە گەڕانەوەی لە بەدردا مردووە،[٤٣٨٢] بەڵام هەموو راکانی تر بە گێرانەوەکانی تری ئیبن سەعدیشەوە بەڵگەی ئەوەن کە خونەیس لە ئوحوددا بەشدار بووەو تیایدا بریندار بووەو بەو هۆیەوە پاش ئوحود مردووە، جا ئەمە دەیسەلمێنێت ئەو رووداوە پەیوەست نەبووە بە کاتی مردنی روقییەی کچی پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، ئەوەتا ئیبن سەعدیش دەڵێت خونەیسی مێردی حەفصە لە پاش دوو ساڵ و یەك مانگ پاش کۆچی مەدینە وەفاتی کرد،[٤٣٨٣] دەی دوای مردنی خونەیس ماوەی عیددەی حەفصە تەواو بووە ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوسەری گرتووە.

پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی سێیەمی کۆچیدا حەفصەی بەهاوسەرگرت،[٤٣٨٤] ئەمەش رای زۆرینەی زانایانە،[٤٣٨٥] جا بەو پێیەی لە پێنج ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی لەدایك بووبێت و لە ساڵی سێی کۆچیدا بووبێتە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)، واتە تەمەنی نزیکەی بیست ساڵێك بووە.[٤٣٨٦]

هاوسەرگیری حەفصە دوای عائیشە بوو، واتە پێغەمبەر(ﷺ) پاش عائیشە حەفصەی بەهاوسەرگرتووە.[٤٣٨٧]

عائیشە و حەفصەی دایکانی باوەڕداران غیرەیەکیان هەبوو بەرامبەر بە هەڵوێستێك کە پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ زەینەبی کچی جەحش هەیبوو، حەفصە دوای عائیشەو زەینەبیش دوای حەفصە بوون بە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) کە دەچوو بۆ لای زەینەب لای ئەو هەنگوینی دەخوارد، عائیشەو حەفصەش بڕیاریاندا پێکەوە کارێك بکەن پێغەمبەر(ﷺ) راگرن لەو خواردنی هەنگوینە، بۆیە بڕیاریان دا پێغەمبەر(ﷺ) بچێت بۆ لای هەرکامیان بڵێن ئەوە مەغافیرت خواردووە (خواردنێکی بۆن ناخۆشە)، ئەو بۆنەت لێ دێت، پێغەمبەریش (ﷺ) کە ئەوەی پێ وترا فەرمووی (نا،

---

٤٣٨١ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٤٥٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٥، أسد الغابة، ج٢، ص ١٨١.

٤٣٨٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢١٧.

٤٣٨٣ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٣٩٢.

٤٣٨٤ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٧.

٤٣٨٥ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٨١١.

٤٣٨٦ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٧

٤٣٨٧ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٢.

بەڵام من لای زەینەبی کچی جەحش هەنگوینم خواردووە، ئیتر هەرگیز نایخۆم و سوێندیشم خواردووە، هەواڵی ئەمەش مەڵێ بە کەس)،[4388] ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ، قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ، وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَنْ بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنْبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ)،[4389] (ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆچی شتێك لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت تۆ ڕەزامەندی ژنەکانت دەوێ لە کاتێکدا خوا لێخۆشبووی میهرەبانە، بێگومان خوا دایناوە بۆتان هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتان خوا کارساز و دۆستی ئێوەیە وە ئەو زانای کاردروستە، کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) بەنهێنی لای هەندێ لە ژنەکانی قسەیەکی درکاند ئینجا کە ئەو (ژنە) قسەکەی کرد (بۆ هەوێکەی) خواش پێغەمبەری (ﷺ) ئاگادار کرد (پێغەمبەر(ﷺ)) هەندێك (لە قسەکان) ی باسکرد و بێ دەنگ بوو لە هەندێکی تری ئینجا کە پێی وت (ژنەکەی) وتی: کێ ئەمەی پێ گەیاندی فەرمووی خوای زانای ئاگادار پێی گەیاندم، ئەی (حەفصە و عائیشە) ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خودا (جێ ی خۆیەتی) چونکە بەڕاستی دڵتان لایدا (لە حەق و ڕاستی) وە ئەگەر پشتی یەکتر بگرن لە دژی پێغەمبەر(ﷺ) (سەرکەوتوو نابن) چونکە بێگومان خوا پشگیری ئەوەو هەروەها جوبرەئیل و ئیمانداره چاکەکانیش دوای ئەوان فریشتەکانیش پشتیوانی ئەون).

## وەستانێك

لە گێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا هەمان بەسەرهات هاتووە، بەڵام وا هاتووە کە خاوەنی هەنگوینەکە حەفصە بووەو پلان دانانەکەش عائیشەو سەودە بون،[4390] بەڵام ئیبن حەجەر لە شەرحی بوخاریدا دەڵێت دەگونجێت ئەو ڕووداوە جارێکی تر بووبێت و پەیوەست نەبووە بەم ڕووداوەو بە دابەزینی ئەم ئایەتانەوە، چونکە ڕووداوی هەنگوینەکەی زەینەب و پێ ناخۆش بوونی عائیشەو حەفصە چەسپاوە، لەو بارەشەوە مشتومڕێکی ورد دێنێت، ئەو پێی وایە کە لەوانەیە ڕووداوەکەی هەنگوین خواردن لای

---

٤٣٨٨ - صحيح البخاري، الرقم ٤٦٣٠.

٤٣٨٩ - صحيح مسلم، الرقم ٢٧٧٢.

٤٣٩٠ - صحيح مسلم، الرقم ٢٧٧٣.

حەفصە پێش ئەم ڕووداوە بوویێت و پەیوەست نەبوویێت بەو ئایەتانەوە،[٤٣٩١] بەڵام ئەمە وردەکاری دەوێت، چونکە ناکرێت پێغەمبەر(ﷺ) دوو جار بە هەمان ڕووداو تێکەوتبێت، وەك خۆی لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت (لا يلدغ المؤمن من جحر واحد مرتين)،[٤٣٩٢] (باوەڕدار دوو جار لە کونێکدا ناگەزرێت)، ناگونجێت پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم جار بەو جۆرەی بەرامبەر کرابێت و بۆ جاری دووەمیش هەمان شتی بەرامبەر کرابێت و هەستی پێ نەکردبێت، دوور بێت لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ئەمە بە لاوازدانانی هەست و پێزانینی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، بۆیە دەکرێت ئەگەرێکی تر هەبێت، ئەویش ئەوەیە دەبێت پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار نەبوویێت بە ڕووداوی یەکەم و ئەو شتەی بۆ ئاشکرا نەبوویێت تا لە ڕووداوی دووەمدا ئینجا خوای گەورە ئاشکرای کردبێت، چونکە وەك هاتووە کاتێك هەریەك لە عائیشەو سەودە وا دەڵێن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەویش دەچێتەوە بۆ لای حەفصە، حەفصە دەڵێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو هەنگوینەت بۆ تێبکەم؟ ئەویش دەفەرموێت نا پێویستم نیە، ئینجا سەودە بە عائیشەی وت سوبحانەڵا، بەخوا ئەو هەنگوینەمان لێ حەرام کرد، عائیشەش بە سەودەی وت بێدەنگ بە،[٤٣٩٣] بۆیە نابینین هیچ سوێند خواردنێکی تێدا بوویێت بۆ نەخواردنی و باسی دابەزینی ئایەتەکەشی تێدا نیە.

بەهەرحاڵ ئەم ڕووداوە بەڵگەیە لەسەر بوونی غیرە لای ئافرەتان، وەك دەبینین ئوممو سەلەمەی دایکی باوەڕداران خۆی دان بەوەدا دەنێت و کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) داوای دەکات ئەو دەڵێت ئاخۆ من ئافرەتێکم غیرەیەکی زۆرم تێدا هەیە،[٤٣٩٤] هەروەها کاتێك پرسیار دەکرێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆچی ئافرەتێکی پشتیوانان بەهاوسەر ناگریت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێت (إن فيهم غيرة شديدة)،[٤٣٩٥] (ئەوان غیرەیەکی زۆر زۆریان تێدایە).

---

٤٣٩١ - فتح الباري، ج٩، ص ٣٧٦ - ٣٧٧.

٤٣٩٢ - صحيح البخاري، الرقم ٥٧٨٧، صحيح مسلم، الرقم ٥٤٢٧، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٦٤، سنن أبي داود، الرقم ٤٢٤١، سنن الدارمي، الرقم ٢٧٣١، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٨٧٢٥، المعجم الاوسط للطبراني، الرقم ٦٨٨٩.

٤٣٩٣ - صحيح مسلم، الرقم ٢٧٧٣.

٤٣٩٤ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٦٠٢٤،

٤٣٩٥ - المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٨٣٦٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥١٩٧، معجم أبي يعلى الموصلي، الرقم ١٦٠.

هەروەك ئەمە بەڵگەیەكی جوان و روونە بۆ موسڵمان تا ئەگەر هەڵەیەكی لە هەر كەسێك بەدی كرد نەیكاتە بیانوو بۆ سفركردنەوە یان شكاندنی ئەو كەسە، چونكە مرۆڤ هەركات جێی هەڵەكردنەو دەكەوێتە هەڵەوە، دەبینین ئەوە هاوسەرانی پێغەمبەری خوان (ﷺ) و دایكانی باوەڕداران، كەچی دەكەونە هەڵەوەو تەوبەش دەكەن و خوای گەورەش نایانشكێنێتەوە، بەڵكو پێشنیازی تەوبەیان بۆ دەخاتەڕوو، پێغەمبەریش (ﷺ) هەڵوێستی قورسی نەگرتەبەر بەرامبەریان و كارەكەی جێهێشت بۆ فەرمانی خوا، كەچی دەبینین لە رۆژگاری ئەمڕۆدا موسڵمانانێك هەن چاو دادەخەن لە ئاست هەوڵ و ماندوێتی بانگەواز و جیهاد و رەنجی دەیان یان سەدان بانگخوازی رێی خوادا و بە بینینی هەڵەیەك لە هەر كەسێك لەوانە دەكەونە زەقكردنەوەی هەڵەكەی و شكاندنی و ئیدی بە كەم تەماشاكردنی، جا خۆ ئەگەر وا بوایە دەبوو ئەم ژنانەی پێغەمبەر(ﷺ) لەو ئاستە بەرزەیان داماڵرابان و دەركرابان، بەڵام ئایا خوا و پێغەمبەر(ﷺ) بڕیار و خوێندنەوەیان بۆ باری مرۆیی وایە؟ نەخێر، خوا دایناوە مرۆڤ هەڵە دەكات و تەوبەی لەسەر واجب دەبێت، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (كل بني آدم خطاء و خير الخطائين التوابون)، (هەموو ئادەمیزاد هەڵەكارن و چاكترینی هەڵەكاران تەوبەكارانن)، تەنانەت خوای گەورە دایناوە هەر دەبێت مرۆڤ هەڵە بكات و تەوبەی لێ بكات، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە (والذي نفسي بيده لو لم تذنبوا لذهب الله بكم، ولجاء بقوم يذنبون فيستغفرون الله فيغفر لهم)،[٤٣٩٦] (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئێوە تاوان نەكەن، بە دڵنیاییەوە خوای گەورە ئێوە لادەبات و خەڵكانێك دێنێت كە تاوان دەكەن و ئینجا داوای لێخۆشبوون لە خوا دەكەن و خوای گەورەش لێیان خۆش دەبێت).

عومەری كوڕی خەططاب دەڵێت من و دراوسێیەكی پشتیوانیم كە لە سەرووی شاری مەدینەوە بووین هەر رۆژەو یەكێكمان دادەبەزی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئیتر ئەوەمان دەچوو هەواڵی سروش و پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەهێنا بۆ ئەوی ترمان، جارێك كە سەرەی پشتیوانیەكە بوو، گەڕایەوەو بە توندی دای لە دەرگا و منیش تەواو ترسام، وتی شتێكی گەورە روویداوە، مەسەلەكەی بۆ باس كرد، منیش چووم بۆ لای حەفصەو بینیم دەگری، وتم ئایا پێغەمبەر(ﷺ) تەڵاقی داون؟ ئەویش وتی نازانم،

---

٤٣٩٦ - صحيح مسلم، الرقم ٥٠٤٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٧٨٧٤.

ئینجا چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەر بە پێوە وەستابووم وتم ئایا ژنەکانت تەڵاق داون؟ ئەویش فەرمووی نا، منیش وتم الله أکبر.[4397]

جیا لەو رووداوە پێغەمبەر(ﷺ) تەڵاقێکی حەفصەی دا، دواتر گێڕایەوە بۆ لای خۆی، چونکە جبرەئیل هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرموو (راجع حفصة، فإنها صوامة قوامة، و إنها زوجتك في الجنة)،[4398] (حەفصە بگێڕەوە، چونکە ئەو زۆر رۆژوو دەگرێت و زۆر شەونوێژ دەکات، هەروەها ئەو هاوسەرت دەبێت لە بەهەشتدا).

کاتێك حەفصە تەڵاق درابوو، عومەر چوو بۆ لای و بینی حەفصە دەگری، وتی بۆچی دەگریت؟ لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) تەڵاقی داویت؟ ئەو تەڵاقی داویت و لەبەر من دەتگێڕێتەوە، دە بەخوا ئەگەر جارێکی تر تەڵاقت بدات هەرگیزاو هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم.[4399]

حەفصە دەڵێت رۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵەوە بوو و جلەکەی خستبووە نێوان رانەکانی، ئەوەبوو ئەبووبەکر هات و داوای مۆڵەتی کرد و مۆڵەتی پێدراو هاتە ژوورەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هەروەك خۆی مایەوەو خۆی تێکنەدا، ئینجا عومەریش هات و هەمان شت روویدا، ئینجا عەلی هات و هەمان شت روویدا، ئینجا هاوەڵانێکی تر هاتن و پێغەمبەر(ﷺ) هیچ خۆی تێکنەدا و هەر لەو شێوەی خۆیدا مایەوە، ئینجا عوثمان هات و داوای مۆڵەتی کرد، مۆڵەتی پێدرا تا بێتەژوورەوە، خێرا پێغەمبەر(ﷺ) جلەکانی رێککرد، ئینجا کەوتنە قسەکردن و پاش ماوەیەك خەڵکەکە چوون، منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبووبەکر و عومەری و عەلی و ئەو هاوەڵانەی تر هاتن تۆ هیچ خۆت تێکنەدا، کەچی کە عوثمان هات خێرا خۆت کۆکردەوەو جلەکانت رێککرد، ئەویش فەرمووی: (ألا أستحيي ممن تستحيي منه الملائكة)،[4400] (ئایا شەرم نەکەم لە کەسێك کە فریشتە شەرمی لێ دەکات)

---

٤٣٩٧ - صحيح البخاري، الرقم ٨٩.

٤٣٩٨ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٧٩٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٥٧٢١، سكت عنه الذهبي في التلخيص، صال الألباني أما تطليقه لحفصة و كونه أمر بإرجاعها صحيح، أما قول جبريل(راجعها...) حسن، انظ سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٢٠٠٧،

٤٣٩٩ - صحيح ابن حبان، الرقم ٤٣٣٨، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ١٦١، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٩١٩٩، قال شعيب الأرناؤوط إسناده جيد، قال الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة الرقم ٢٠٠٧ فلا يفرح بمتابعته. وللحديث شواهد مختصرة.

٤٤٠٠ - مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٥٨٩٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٣٠١٧، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٩٢٤٩.

دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد و بڕیاردرا قورئان کۆبکرێتەوەو، زەید راسپێردرا بەو کارەو دواجار هەموو قورئان نووسرایەوە، دواتر ئەبووبەکر ئەو نوسخەی دایە لای عومەری کوڕی خەططاب، پاش مردنی عومەر نوسخەکەی قورئانەکە کەوتە لای حەفصەی دایکی باوەڕداران، لە سەردەمی عوثماندا خەلیفە داوای لە حەفصە کرد ئەو نوسخەی قورئانەی لایەتی بیداتە لایان تا هەموو موسڵمانان لەسەر یەك خوێندنەوەی قورئان یەکدەنگ بن.[٤٤٠١]

لە سەرەتای خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا، کاتێك دایکی باوەڕداران عائیشە ئیجتیهادی ئەوەی کرد دەبێت بکوژانی عوثمان خێرا بکوژرێنەوەو لەسەر ئەوە لەگەڵ خەلیفە راجیایی کەوتە نێوانیان و عائیشە بڕیاری دا بەرەو بەصرە بڕوات، حەفصەش بڕیاری دا لەگەڵ عائیشەدا بڕوات بۆ بەصرە، بەڵام عەبدوڵای برای رێگری لێکرد و نەیهێشت لەگەڵ عائیشەدا بچێت.[٤٤٠٢]

سەبارەت بە کاتی مردنی دایکی باوەڕداران حەفصە راجیایی هەیە، رایەك دەڵێت لە جەمادیئلوولای ساڵی چل و یەکی کۆچیدا وەفاتی کرد کاتێك حەسەنی کوڕی عەلی بەیعەتی دا بە موعاویە، رایەکی تر دەڵێت لە ساڵی چل و پێنجی کۆچی وەفاتی کرد.[٤٤٠٣]

ئیبن کەثیر دەڵێت رای راستتر ئەوەیە کە لە شەعبانی ساڵی چل و پێنجی کۆچیدا مردووەو ئەوکات تەمەنی شەست ساڵان بووە،[٤٤٠٤] بەڵام ئەگەر پێنج ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی لەدایك بووبێت و لە ساڵی ٤٥ی کۆچیش وەفاتی کردبێت، ئەوە تەمەنی دەبێت نزیکەی شەست و سێ ساڵێك بووبێت.

والی ئەوکاتی مەدینە مەڕوانی کوڕی حەکەم نوێژی مردووی لەسەر تەرمی حەفصەی دایکی باوەڕداران ئەنجام دا،[٤٤٠٥] هەریەك لە مەڕوان و ئەبووهورەیرە تەرمەکەی حەفصەیان بەرەو گۆڕستان هەڵگرتبوو.[٤٤٠٦]

---

٤٤٠١ - البدايةو النهاية لابن كثير، ٧، ص ٢١٧.

٤٤٠٢ - البدايةو النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣١.

٤٤٠٣ - أسد الغابة، ج٧، ص ٧٥.

٤٤٠٤ - البدايةو النهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٠.

٤٤٠٥ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٩.

٤٤٠٦ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٣٠.

دایکی باوەڕداران حەفصە ژمارەیەك فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێراوەتەوە، ذەهەبی دەڵێت: لە کتێبەکەی (بقي بن مخلد) دا ژمارەی ئەو فەرموودانەی نووسراون کە دایکی باوەڕداران حەفصە گێڕاویەتیەوە شەست فەرموودەن، چوار فەرموودەیان لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هەن، شەش فەرموودەشیان تەنها لە موسلیمدا هاتون،[٤٤٠٧] ئەوانی تر لە کتێبەکانی تری فەرموودەدا هەن، لەوانە چەند نموونەیەك وەردەگرین:

حەفصەی دایکی باوەڕداران دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (لا يحل لامرأة تؤمن بالله و اليوم الآخر أن تحد على ميت فوق ثلاثة أيام إلا على زوجها فإنها تحد عليه أربعة أشهر و عشرا).[٤٤٠٨]

(بۆ هیچ ئافرەتێك نیە کە بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت زیاتر لە سێ ڕۆژ خەمپۆشی هەبێت بۆ مردوویەك مەگەر بۆ مەرگی مێردەکەی، ئەمەیان بۆی هەیە چوار مانگ و دە ڕۆژ خەمپۆشی هەبێت بۆی). مەبەست بە خەمپۆشی پۆشینی بەرگی خەمباری نیە، بەڵکو وازهێنانە لە خۆ ڕازاندنەوە.

حەفصەی دایکی باوەڕداران دەڵێت کاتێك بانگبێژ لە بانگی بەیانی دەبوویەوەو بەرەبەیان دەهات، پێغەمبەر(ﷺ) دوو ڕکاتی کورت نوێژی دەکرد پێش ئەوەی نوێژی بەیانی بکرێت.[٤٤٠٩]

حەفصەی دایکی باوەڕداران دەڵێت بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (ليؤمن هذا البيت جيش يغزونه حتى إذا كانوا ببيداء من الأرض يخسف بأوسطهم وينادي أولهم آخرهم ثم يخسف بهم فلا يبقى إلا الشريد الذي يخبر عنهم).[٤٤١٠]

(سوپایەك بەڕێدەکەون هێرش بێنن بۆ کەعبە تا دەگەنە زەویەکی ڕووتەڵان و چۆڵەوانی، لەوێ ئەوانەی لە ناوەڕاستی سوپاکەدان دەبرێن بە ناخی زەویدا، ئەوانەی پێشەوە هاوار دەکەن لەوانەی دواوە، دواتر هەموویان دەبرێن بە ناخی زەویداو کەسیان لێ دەرناچێت تەنها کەسێ نەبێت کە ڕادەکات و هەواڵی ئەوانی تر دەباتەوە).

---

٤٤٠٧ - نفس المصدر.

٤٤٠٨ - صحيح مسلم، الرقم ٢٨١٥، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٣٦٤، السنن الصغرى للنسائي، الرقم ٤٦٦٤، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ١٥٧١٦.

٤٤٠٩ - صحيح مسلم، الرقم ١٢١٩،

٤٤١٠ - صحيح مسلم، الرقم ٥٢٤٠ و اللفظ له، سنن ابن ماجة، الرقم ٤٠٦٠، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٣٧٣٥، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٥٨٧٠، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٩٢٣٩.

## جوەیریەی كچی حارث(رضي الله عنها)

ناوی جوەیریەی كچی حارثی كوڕی ئەبی ضیراری خوزاعی موصطەلەقیە،[٣٤٣٩] جوەیریە دایكی باوەڕداران و ژنی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

جوەیریە برایەكی هەبوو بە ناوی عەمر كە ئەویش دواتر موسڵمان بوو و فەرموودەشی لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) گێڕاوەتەوە.[٣٤٤٠]

ئەم ئافرەتە ژنی موسافیعی كوڕی صەفوان بوو كە لە غەزای مورەیسیعدا كوژرا، كاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە غەزای مورەیسیعدا هێرشی بردە سەر بەنیلموصطەلەق جوەیریە بە كەنیزەك گیرا، بوو بە پشكی ثابتی كوڕی قەیس.[٣٤٤١]

---

٣٤٣٩ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٥.

٣٤٤٠ - صحيح البخاري، الرقم ٢٦٠٧.

جوەیریە دەڵێت کاتێك سوپاکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرەو رووەمان هات، باوکم وتی وا سوپایەکی بێ سەر و بن هات، منیش سوپایەکم بەرچاو دەکەوت کە لە زۆریدا لەباس نەدەهات، کەچی کاتێك موسڵمان بووم و پێغەمبەر (ﷺ) بەهاوسەری گرتم و موسڵمانانم بینی زانیم ئەوە هەمووی ترس و شکۆیەك بوو کە خوا بەخشیبووی بە موسڵمانان.[٣٤٤٢]

جوەیریە دەڵێت سێ شەو پێش ئەوەی موسڵمانان هێرش بێنن بۆمان خەوم بینی مانگ لە مەدینەوە هات و کەوتە ناو ژوورەکەمەوە، بەڵام حەزم نەکرد ئەو خەوە بۆ کەس بگێڕمەوە.[٣٤٤٣]

جوەیریە ئافرەتێکی زۆر جوان و خوێن شیرین بوو و هەرکەس بیبینیایە دڵی دەچوویە سەری.[٣٤٤٤]

جوەیریە بۆ ئەوەی نەبێتە کۆیلەی ثابت هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و داوای یارمەتی کرد، دایکمان عائیشە دەڵێت سوێند بەخوا هەر کە بینیم رق بەرامبەری دایگرتم، جوەیریە کە هاتە ژوورەوە وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من جوەیریەی کچی حارثم کە گەورەی هۆزەکەی خۆیەتی، دەبینیت تووشی چی بوم، جا من لەگەڵ ثابت پەیمانی خۆکڕینەوەم داوە، دەی یارمەتیم بدە تا خۆم بکڕمەوەو خۆم ئازاد بکەم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (ئایا لەوە چاکترت پێ ببەخشم و بە هاوسەرت بگرم؟) ئەویش وتی بەڵێ، ئەوەبوو پێغەمبەریش (ﷺ) وایکرد، ئینجا خەڵکی بیستیانەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) جوەیریەی بەهاوسەر گرتووە وتیان چۆن دەکرێت خزمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لای ئێمە کۆیلەو کەنیزەك بن، بۆیە چی کۆیلەو کەنیزەکی بەنیلموصطەلەقیان لا بوو هەموویان ئازاد کردن، بەوە بەهۆی ئەم ئافرەتەوە خوای گەورە نزیکەی سەد ماڵی بەنیلموصطەلەقی ئازاد کرد.[٣٤٤٥]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) جوەیریەی بە هاوسەر گرت باوکی جوەیریە هات و وتی کچی وەك کچی من نابێت بە کەنیزەك بگیرێت، دەی وازی لێ بهێنەو ئازادی بکە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێت چۆنە من جوەیریە خۆی سەرپشك بکەم بۆ بڕیاردان؟ باوکی پرسیاری کرد لە جوەیریە هاتنەوەت پێ باشە یان مانەوە؟ جوەیریە لە وەڵامدا وتی من خواو پێغەمبەرم (ﷺ) هەڵبژاردووە.[٣٤٤٦]

---

٣٤٤١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٥-٥٦٦.

٣٤٤٢ - تأريخ الإسلا للذهبي، ج٢، ص ٢٦٠.

٣٤٤٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٥٩.

٣٤٤٤ - الطبقات الكبرى، ج٨، ص ١١٦.

٣٤٤٥ - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٦٣.

٣٤٤٦ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٦.

جوەیریە دەڵێت کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بەهاوسەری گرتم من تەمەنم بیست ساڵان بوو.[٣٤٤٧]

جارێك پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ لای جوەیریەو ڕۆژی هەینی بوو و ئەوکات جوەیریە بەڕۆژوو بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئایا دوێنێ بەڕۆژوو بوویت؟ وتی نا، فەرمووی بەیانیش ڕۆژوو دەگریت؟ وتی نا، فەرموی دەی ڕۆژووەکەت بشکێنە.[٣٤٤٨]

سەرەتا ناوی بەڕرە بوو و پێغەمبەر (ﷺ) ناوی گۆڕی بە جوەیریە.[٣٤٤٩]

جوەیریە زۆر جار سەرقاڵی پەرستش و خواپەرستی بوو، جارێك پێغەبمەر (ﷺ) دای بە لای جوەیریەدا بینی سەرقاڵی نزاکردنە، دوای ماوەیەکی تر هەمدی دای بە لایدا تەماشای کرد سەرقاڵی پەرستشە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هێشتا سەرقاڵیت بەو حاڵەتەوە؟(سەرقاڵی نزا کردنیت؟) وتی بەڵێ، فەرمووی (لقد قلت بعدك أربع كلمات ثلاث مرات، لو وزنت بما قلت منذ اليوم لوزنتهن: سبحان الله وبحمده، عدد خلقه ورضا نفسه وزنة عرشه ومداد كلماته)،[٣٤٥٠] (من دوای تۆ سێ جار چوار وشەم وت ئەگەر کێشانە بکرێن لەگەڵ ئەوەی ئەمڕۆ تۆ دەتوتن قورسایی ئەوەی تۆیان دەبێت: سبحان الله وبحمده ، عدد خلقه ورضا نفسه وزنة عرشه ومداد كلماته).

سەبارەت بە کاتی مردنی جوەیریە ڕاجیایی هەیە، ڕایەك دەڵێت لە ساڵی پەنجای کۆچیدا وەفاتی کردووە، ڕایەکی تریش دەڵێت لە مانگی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی پەنجاو شەش کۆچیدا وەفاتی کرد، دەوترێت کاتێك وەفاتی کردووە تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو،[٣٤٥١] مەڕوانی کوڕی حەکەمیش نوێژی لەسەر کرد.[٣٤٥٢]

---

٣٤٤٧ - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ١٩٠.

٣٤٤٨ - صحيح البخاري، الرقم ١٩٠٢، صحيح ابن حبان٣٦٧١، الرقم ، صحيح ابن خزيمة، الرقم٢٠٠٩، سنن أبي داود، الرقم٢٠٨٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٧٨٣٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٢٧١١، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٦١٦٥.

٣٤٤٩ - صحيح ابن حبان، الرقم ٥٩١٠، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٨٨٩.

٣٤٥٠ - صحيح مسلم، الرقم ٥٠١١، صحيح ابن خزيمة، الرقم ٧٢٨، سنن أبي داود، الرقم ١٢٩٨، سنن ابن ماجة، الرقم ٣٨٠٥.

٣٤٥١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٦.

٣٤٥٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد ، ج٨، ص ١٢٠، تاريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ١٩٠.

## رەملەی کچی ئەبووسوفیان (رضي الله عنها)

ناوی رەملەی کچی ئەبوسوفیانە، هاوسەری پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و بە ئوممومحەبیبە ناسراوە، هەرچەند ناوی بە هیندیش هاتووە، بەڵام راستتر ئەوەیە کە ناوی رەملەیە،[٥٩٠٦]دایکی ناوی صەفییەی کچی ئەبیلعاصە.[٥٩٠٧]

برایەکی هەبوو بە ناوی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان کە هاوەڵێکی ناسراوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و دامەزرێنەری دەوڵەتی ئومەوی بوو،[٥٩٠٨] برایەکی تریشی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) نەبوو،[٥٩٠٩] برایەکی تری ناوی عوتبە بوو کە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا والی طائیف بوو.[٥٩١٠]

رەملە کە لەدایك بوو تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) نزیکەی بیست و سێ ساڵان بوو، سەرەتا شووی کرد بە عوبەیدوڵای کوڕی جەحش و هەردووکیان پێکەوە موسڵمان بوون، دواتر پێکەوە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، لەوێ حەبیبە منداڵێکی بوو، رایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو لە مەککەو پێش چوون بۆ حەبەشە سکی هەبووەو لە حەبەشە منداڵەکەی بووە، دواتر لەوێ عوبەیدوڵای هاوسەری لە ئیسلام هەڵگەڕایەوەو لە یەکدی جیابوونەوە،[٥٩١١] ئەو منداڵەشی ناوی حەبیبە بوو و کچ بوو.[٥٩١٢]

ئوممومحەبیبە دەڵێت: لە خەومدا عوبەیدوڵای کوڕی جەحشم لە شێوەیەکی زۆر ناشیریندا بینی، منیش ترسام، بەیانی کە هەستام دەبینم بووە بە مەسیحی، منیش خەوەکەم بۆ گێڕایەوە، کەچی ئەو

---

٥٩٠٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٥٥.

٥٩٠٦ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٥١.

٥٩٠٧ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٩٦.

٥٩٠٨ - أسد الغابة، ج٥، ص ٢٢٠.

٥٩٠٩ - أسد الغابة، ج٣، ص ٢٦٧.

٥٩١٠ - أسد الغابة، ج٣، ص ٥٨٠.

٥٩١١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٥١.

٥٩١٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٩٦.

هیچ گرنگی پێ نەدا و کەوتە مەی خواردنەوەو بەردەوام لەو حاڵەدا بوو تا مرد، دوای ئەوە خەوێکم بینی کەسێك بانگی کردم ئەی دایکی باوەڕداران، منیش ترسام و راچڵەکیم، ئەوەبوو ماوەی خۆم تەواوکرد خێرا نێردراوی نەجاشی هات و داوای کردم بۆ پێغەمبەر (ﷺ).[5913]

پێغەمبەر (ﷺ) عەمری کوڕی ئومەییەی نارد بۆ لای نەجاشی تا داوای ئوممو حەبیبەی بۆ بکات،[5914] نەجاشیش ئافرەتێکی نارد بە ناوی ئەبرەهە تا هەواڵ بدات بە ئوممو حەبیبە، ئەبرەهە وتی پاشا دەڵێت: کەسێك بکەرە وەکیلی خۆت تا هاوسەرگیریەکەت بۆ بکات، منیش هەواڵم نارد بۆ خالیدی کوڕی سەعید و ئەوم کرد بە وەکیل.

لە حەبەشە کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) پەیامی نارد تا ئوممو حەبیبەی لێ مارە بکرێت، خالیدی کوڕی سەعید کە ئامۆزای ئوممو حەبیبە بوو بەرپرسیارێتی مارەکردنی ئوممو حەبیبەی گرتەئەستۆو نەجاشیش وەکیلی پێغەمبەر (ﷺ) بوو بۆ قبووڵی گرێبەستی هاوسەرگیریەکە، نەجاشی بە ئوممو حەبیبەی راگەیاند کەسێك راسپێرە تا مارەت بکەم لە پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش هەواڵی نارد بۆ خالیدی کوڕی سەعید و ئەوی کرد بە وەکیل.[5915]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) پەیامی نارد بۆ نەجاشی تا ئوممو حەبیبەی لێ مارە بکات، نەجاشی ئامادەسازی بۆ کرد و ناردی بە شوێن جەعفەردا و موسڵمانانی هاودەمی جەعفەریشی بانگ کرد، کە هاتن نەجاشی وتارێکی پێشکەش کرد و بەبەرچاویانەوە شایەتومانی دووبارە کردەوە.[5916]

دەمەو ئێوارە بوو نەجاشی هەواڵی نارد بۆ جەعفەرو هاوەڵانی، کە هاتن جەعفەر سوپاس و ستایشی خوای کرد و شایەتومانی وتەوەو دواتر وتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نامەی بۆ ناردوم تا ئوممو حەبیبەی لێ مارە بکەم و منیش چوم بە دەم داواکەیەوەو مارەییەکەی چوارسەد دینارم داناوە، دواتر دینارەکانیشی هەڵڕشت، ئینجا خالیدی دواند و ئوممحوحەبیبەی مارە کرد و دینارەکانی دایە دەست خالید،[5917] ئینجا جەعفەر و هاوەڵان ویستیان هەستن، نەجاشی وتی نابێت، سوننەتی

---

٥٩١٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٥١-٦٥٢.

٥٩١٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص٦٠٢.

٥٩١٥ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٤٣-١٤٤.

٥٩١٦ - سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٤٣.

٥٩١٧ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٥٢.

پێغەمبەران وایە کە هاوسەرگیرییان کرد خوانێك ساز بکەن،[٥٩١٨] بۆیە نەجاشی خواردنێکی ئامادە کرد و هەموان لە خوانەکەیان خوارد، ئوممو حەبیبە دەڵێت: کە پارەکەم گەیشتە دەست پەنجا دیناریم دا بە ئەبرەهە، ئەویش بۆی گێڕامەوەو وتی پاشا ئەو کارەی پێ سپاردوم،[٥٩١٩] پێی وتوم هیچت لێ وەرنەگرم، بەڵکو فەرمانی کردووە بە ژنەکانی چی بۆنی خۆشیان لا هەیە ئامادەی بکەن بۆت،[٥٩٢٠] بۆ بەیانیەکەشی ئەبرەهە بە کۆڵێك بۆن و شمەکی ناوازەوە هاتەوە بۆ لام و منیش ئەوانەم بردەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)،[٥٩٢١] ئینجا کە چوومەوە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو ئەو وردەکاریانەم بۆ باسکرد، ئەویش بزەیەکی کرد، پاشان سەلامی ئەبرەهەم پێگەیاند، ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە.[٥٩٢٢]

مارەییەکەی ئوممو حەبیبە زیاترین مارەیی ناو هەمو خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو.[٥٩٢٣]

کاتێك ئوممو حەبیبە گەیشتەوە مەدینە تەمەنی نزیکەی سی و ئەوەندە ساڵ بوو.[٥٩٢٤]

پێغەمبەر (ﷺ) لە دەستکەوتەکانی خەیبەردا نزیکەی هەشتا کۆڵ خورما و بیست کۆڵ گەنمی بەخشی بە ئوممو حەبیبە.[٥٩٢٥]

ئەبووسوفیان کە ئەو هەواڵەی بیست زۆر دڵتەنگ بوو و پێی ناخۆش بوو.[٥٩٢٦]

کاتێك قورەیشیەکان بەڵێنی حودەیبیەیان شکاند و پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاری دا هێرش بباتەسەر مەککە، ئەبووسوفیان هاتە مەدینە بەو هیوایەی ئاگربەستەکە درێژ بکاتەوە، ئینجا چوویە ماڵی ئوممو حەبیبەی کچی، کاتێك ویستی لەسەر جێگەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دابنیشێت، ئوممو حەبیبە ڕاخەرەکەی لابرد و نەیهێشت، ئەبووسوفیان پێی وت بۆچی وادەکەیت؟ ئوممو حەبیبەش وتی ئەوە

---

٥٩١٨ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٩٨.

٥٩١٩ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٥٢.

٥٩٢٠ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٩٨.

٥٩٢١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٥٢.

٥٩٢٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٩٨.

٥٩٢٣ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٩.

٥٩٢٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٩٩.

٥٩٢٥ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٩٩.

٥٩٢٦ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٥٢.

راخەری پێغەمبەری خوایەو تۆش کەسێکی بێباوەڕی پیسیت، ئەبوسوفیان وتی کچەکەم پاش خۆم خراپت لێ قەوماوە.[5927]

ئوممو حەبیبە دەڵێت: جارێك وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوشکەکەم بە هاوسەر بگرە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەوەت پێ خۆشە؟ وتم بەڵێ،... پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەوەم بۆ حەڵاڵ نیە).[5928]

ئوممو حەبیبە دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو:(ما من عبد مسلم يصلي لله كل يوم ثنتي عشرة ركعة تطوعا غير فريضة، إلا بنى الله له بيتا في الجنة)،[5929] (هەر بەندەیەکی موسڵمان هەموو رۆژێك دوانزە رکاتی سوننەت بە خۆبەخشی و جیا لە فەرز بۆ خوا ئەنجام بدات، ئەوە خوای گەورە لە بەهەشتدا خانوویەکی بۆ بنیاد دەنێت).

ئوممو حەبیبە جارێك سەردانی دیمەشقی کرد بە نیازی سەردانی کردنی موعاویەی برای،[5930] ئوممو حەبیبە لە دەوڵەتەکەی موعاویەدا رێز و ناوبانگێکی زۆری هەبوو.[5931]

کاتێك ئەبووسوفیان کۆچی دوایی کرد، هەواڵ گەیشتە ئوممو حەبیبەی کچی، لە رۆژی سێیەمدا بۆنێکی دا لە لاجانگ و باڵەکانی و وتی خۆ من هیچ پێویستم بەوە نیە لەبەرئەوە نەبێت کە بیستوومە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو:(لا يحل لامرأة تؤمن بالله واليوم الآخر أن تحد على ميت فوق ثلاث، إلا على زوج فإنها تحد عليه أربعة أشهر وعشرا)،[5932] (بۆ هیچ ئافرەتێك کە بڕوای بە خوا و رۆژی دوایی هەبێت دروست نیە زیاد لە سێ رۆژ پرسە بگێرێت بۆ مردوویەك تەنها بۆ مێردی نەبێت کە بۆی هەیە چوار مانگ و دە رۆژ پرسە بگێڕێ– بەو واتایەی خۆی دوور بگرێت لە خۆرزاندنەوەو خۆشی گێڕان–).

---

٥٩٢٧ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٠٠.

٥٩٢٨ - صحيح البخاري، الرقم ٤٨١٣.

٥٩٢٩ - صحيح مسلم، الرقم ١٢٣٥ واللفظ له، صحيح ابن خزية، الرقم ١١١٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ١٤٥٢، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٦٧٨٣.

٥٩٣٠ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٠.

٥٩٣١ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٢.

٥٩٣٢ - صحيح البخاري، الرقم ١٢٣٣، صحيح مسلم، الرقم ٢٨٠٨، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٣٦٦، سنن الترمذي، الرقم ١١٥٢.

**سەبارەت بە کاتی کۆچی دوایی ئوممومحەبیبە راجیایی هەیە، رایەك دەڵێت: لە ساڵی چل و دووی کۆچی بووە، رایەك دەڵێت: ساڵی چل و چوار بووە، رایەك دەڵێت: ساڵی پەنجاو نۆی کۆچی بووە کە ئەم رایەیان دوورە لە راستیەوە.**[٥٩٣٣]

٥٩٣٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٥٣.

# سەودەی کچی زەمعە(رضي الله عنها)

ناوی سەودەی کچی زەمعەی کوڕی قەیسی قورەیشی عامیرە، هاوسەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) و دایکی باوەڕدارانە،[7310] دایکی ناوی شومووسی کچی قەیسە و خەڵکی مەدینە بووە.[7311]

سەودە سەرەتا هاوسەری سەکرانی کوڕی عەمر بوو، سەکران و سەودە هەردووکیان باوەڕیان هێنا و کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، رایەك دەڵێت سەکران لە حەبەشە مرد، رایەکیش دەڵێت بەڵکو هاتنەوە مەککەو لەوێ سەکران کۆچی دوایی کرد.[7312]

دوای وەفاتی خەدیجە پێغەمبەر (ﷺ) سەودەی بەهاوسەر گرت و ماوەیەك تەنها سەودە خێزانی بوو، هەندێ دەق هاتووە کە نزیکەی سێ ساڵ تەنها سەودە هاوسەری بوو، ئینجا عائیشەی بەهاوسەرگرت.[7313]

پێغەمبەر (ﷺ) پاش مەرگی سەکران وەستا تا ماوەی سەودە تەواو بوو، پاشان داوای کرد، سەودە وتی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) قسەی من لەدەست تۆیە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دەی کەسێك لە خزمانت راسپێرە تا بەشووت بدات، ئەویش حاطیبی کوڕی عەمری راسپارد، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) سەودەی بەهاوسەر گرت.[7314]

سەودە تەمەنی زۆر بوو، دەترسا پێغەمبەر (ﷺ) تەڵاقی بدات،[7315] بۆیە داوای کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) تەڵاقی نەدات، هەروەها ئەو رۆژەی خۆی کە مافی بوو پێغەمبەر (ﷺ) بچێتەوە بۆ لای، بەخشی بە عائیشە.[7316]

---

٧٣١٠ - سير أعلام النبلاء، ج٢،ص ٢٦٥.

٧٣١١ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٧٣.

٧٣١٢ - أسد الغابة، ج٢، ص ٤٨٢.

٧٣١٣ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٦٥.

٧٣١٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٥٣.

٧٣١٥ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٥٣.

٧٣١٦ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٧٣.

**کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، پاش ماوەیەك زەید و ئەبوورافیعی بە دوو وشترەوە نارد بۆ مەککە تا فاطیمەو ئوممکلثوم و سەودەی کچی زەمعەو ئوممئەیمەن و ئوسامەی کوڕی زەید بهێنن بۆ مەدینە.[٧٣١٧]**

**عومەری کوڕی خەططاب داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد تا رووپۆش بۆ ژنەکانی بەکاربهێنێت، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ)رازی نەبوو، شەوێك سەودەی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) کە ژنێکی باڵابەرز بوو چوویە دەرەوە، عومەر وتی ئەی سەودە تۆمان ناسیەوە، دوای ئەوە ئایەتی حیجاب دابەزی.[٧٣١٨]**

**پێغەمبەر (ﷺ) لە دەستکەوتەکانی خەیبەردا هەشتا کۆڵ خورما و بیست کۆڵ گەنمی پێدا.[٧٣١٩]**

**رایەك دەڵێت سەودە لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا کۆچی دوایی کردووە، رایەکی تریش دەڵێت لە شەووالی ساڵی پەنجاو چواری کۆچیدا لە مەدینە وەفاتی کرد.[٧٣٢٠]**

---

٧٣١٧ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٦٩.

٧٣١٨ - صحيح البخاري، الرقم ١٤٥.

٧٣١٩ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٥٦.

٧٣٢٠ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٦٧.

## زەینەبی کچی خوزەیمە(دایکی باوەڕداران) (رضي الله عنها)

**ناوی زەینەبی کچی خوزەیمەی کوڕی حارثی کوڕی عەبدوڵای هیلالیە، هاوسەری پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، زیاتر بە ئوممولمەساکین (دایکی هەژاران) ناسراوە، ئەمەش لەبەرئەوەی زۆر دەستگرۆ و هاریکاری هەژاران بوو.**[٦٤٠٤]

**زەینەب سەرەتا هاوسەری عەبدوڵای کوڕی جەحش بوو، عەبدوڵای مێردی لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو، دوای ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) زەینەبی بەهاوسەرگرت.**[٦٤٠٥]

**هاوسەرگیری پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ زەینەبی کچی خوزەیمەدا دوای هاوسەرگیری بوو لەگەڵ حەفصەی کچی عومەردا، ئەمەش لە مانگی رەمەزاندا بوو، بەڵام تەنها دوو یان سێ مانگ هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) بوو و دوای ئەوە وەفاتی کرد، یان دەوترێت نزیکەی هەشت مانگێك لای پێغەمبەر**

---

٦٤٠٤ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٤٢.

٦٤٠٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٧٢.

(ﷺ) مایەوە ئینجا وەفاتی کرد، کاتی مردنەکەشی لە مانگی رەبیعولئاخیری ساڵی چوارەمی کۆچیدا بوو، ئەوکات تەمەنی نزیکەی سی ساڵ دەبوو.[٦٤٠٦]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ویستی داوای زەینەب بکات، هێشتا نەیدیبوو، ئەبووئوسەیدی نارد بۆ لای ئافرەتێکی بەنی عامیر تا داوای زەینەبی بۆ بکات، ئەویش چوو داوای کرد بۆی و پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوسەری گرت.[٦٤٠٧]

پێغەمبەر (ﷺ) تا لە ژیاندا بوو تەنها مەرگی دوو هاوسەری خۆی بینی کە ئەوانیش بریتی بوون لە خەدیجەی کچی خوەیلید و زەینەبی کچی خوزەیمە.[٦٤٠٨]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو (ئەوەتان خێراتر دێت بۆ لام کە دەستی درێژترە)، ئێمەش هەموو دەکەوتینە پێوانەی دەستی یەکدی تا بزانین دەستی کاممان درێژترە، دواجار زانیمان دەستی زەینەب درێژترە چونکە ئەو بە دەستی خۆی کاری دەکرد و خێری زۆری پێ دەکرد.[٦٤٠٩]

---

٦٤٠٩ - صحيح مسلم، الرقم ٤٥٩٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٣٧٣.

٦٤١٠ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٧٤.

# زەینەبی کچی جەحش (دایکی باوەڕداران) (رضي الله عنها(

ناوی زەینەبی کچی جەحشەو لە ئەسەدیەکانە، هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) و دایکی باوەڕدارانە، دایکی ناوی ئومەیمەی کچی عەبدولموطەلیبە کە پووری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو،[٦٣٥٩] ئومەیمەی دایکی زەینەب تا سەردەمی خەیبەر مایەوەو پێغەمبەر (ﷺ) لە خەیبەردا چل کۆڵ خورمای پێدا.[٦٣٦٠]

زەینەب سەرەتا ناوی بەڕە بوو، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ناوی نا زەینەب.[٦٣٦١]

زەینەب خوشکێکی هەبوو کە ناوی حەمنە بوو،[٦٣٦٢] برایەکیشی هەبوو بە ناوی عەبدوڵای کوڕی جەحش کە پێش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بچێتە ماڵی ئەرقەمەوە موسڵمان بوو و بەشداری هەردوو کۆچی حەبەشەی کرد.[٦٣٦٣]

برایەکی تری ناوی عەبد بوو کە بە ئەبوو ئەحمەد ناسرابوو، ئەویش لە کۆچەرانی حەبەشە بوو و دواتر هاتە مەدینەو هاوەڵی نزیکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[٦٣٦٤]

زەینەب زۆر زوو موسڵمان بوو و یەکێکیشە لە کۆچەران، هاوسەری زەیدی کوڕی حارثە بوو، بەڵام دواتر زەید تەڵاقی دا و پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی بەهاوسەر گرتەوە.[٦٣٦٥]

مارەییەکەی زەینەب لەلایەن زەیدەوە بریتی بوو لە دە دینار و شەست درهەم و لەچکێك و خاولیەك و درعێك و پەنجا مشت گەنم و دە مشت خورما.[٦٣٦٦]

---

٦٣٥٩ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٣٨.

٦٣٦٠ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤٥.

٦٣٦١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٤٨.

٦٣٦٢ - أسد الغابة، ج٧، ص ٧٨.

٦٣٦٣ - أسد الغابة، ج٣، ص ١٩٥.

٦٣٦٤ - أسد الغابة، ج٣، ص ٥٣١.

٦٣٦٥ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٣٨.

کاتێك زەید ویستی زەینەب تەڵاق بدات، لەگەڵیدا نەدەگونجا، بۆیە دەهاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و سکاڵای حاڵی خۆی دەکرد، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی دەفەرموو (لەخوا بترسەو ژنەکەت لای خۆت بهێڵەرەوە)، ئەوەبوو زەید هەر تەڵاقی داو دواتر پێغەمبەر (ﷺ) زەینەبی بەهاوسەر گرت، ئەوەش لە قورئاندا باس کراوە،[6367] خوا دەفەرمویت: (﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْاْ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ ﴾.

(بیربکەرەوە کاتێ دەت وت بە کەسێ (زەیدی کوڕی حارثە) کە خوا بەهرەی بەسەردا ڕشتبوو تۆیش چاکەت لەگەڵدا کردبوو (بە ئازاد کردنی و پەروەردە کردنی) خێزانت (زەینەب) لای خۆت ڕاگرەو بیهێڵەوە وە لەخوا بترسە لە دڵی خۆتدا شتێك دەشاریتەوە کە خوا ئاشکرای دەکات وە لە (قسەی) خەڵك دەترسی لە کاتێکدا خوا شیاوترە کە لێ ی بترسی ئینجا کاتێ زەید پێویستی بەو (زەینەب) نەما و تەڵاقی دا ئێمە ئەو (زەینەب) مان لێ مارەکردی بۆ ئەوەی هیچ ناڕەحەتی (و تاوانێ) نەبێت لەسەر ئیمانداران لە (مارەکردنی) ژنانی بە کوڕ کراوەکانیاندا کاتێ پێویستیان پێیان نەماو تەڵاقیان دان وە فەرمانی خوا (بە مارە کردنی زەینەب بۆت) دراوە و بڕاوەیە).

زەینەب کە هاوسەرەکانی تری پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەبینی نازی دەکرد و دەیوت ئێوە کەسوکارتان مارەیان کردون لە پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام من خوای گەورە مارەی کردم لە پێغەمبەر (ﷺ).[6368]

سەبارەت بە هاوسەرگیری زەینەب لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لە مانگی زیلقەعدەی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بوو،[6369] ئەوکاتەش تەمەنی زەینەب بیست و پێنج ساڵان بوو،[6370] واتە جیاوازی تەمەنی

---

٦٣٦٦ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٤٥.

٦٣٦٧ - صحيح البخاري، الرقم ٧٠٠٥،

٦٣٦٨ - سنن الترمذي، الرقم ٣٢١٩، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٣٢١٣.

٦٣٦٩ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٤٥.

٦٣٧٠ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٧.

پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ زەینەبی کچی جەحشی هاوسەریدا نزیکەی بیست و هەشتساڵ بووەو ماوەی ژیانی زەینەب لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نزیکەی حەوت ساڵ کەمتر بووە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە زەینەب لە کاتی ئەو هاوسەرگیریەدا تەمەنی سی و پێنج ساڵان بووە.[٦٣٧١]

ئەنەس دەڵێت: کاتێك زەینەب وادەی خۆی تەواو کرد، پێغەمبەر (ﷺ) بە زەیدی فەرموو (بڕۆ داوای زەینەبم بۆ بکە)، زەیدیش دەڵێت: چووم و وتم ئەی زەینەب موژدەت لێ بێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی ناردووە بۆ لات تا داوات بکەم بۆی، ئەویش وتی من هیچ ناکەم تا فەرمان لە پەروەردگارم وەرنەگرم، ئەوەبوو ئایەتی قورئان دابەزی و پێغەمبەریش (ﷺ) هاتە ژوورەوە بێ ئەوەی داوای مۆڵەت بکات.[٦٣٧٢]

لە گێڕانەوەیەکی وردتردا هاتووە زەید دەڵێت: کە چووم بۆ لای زەینەب دەمدی هەویر دەشێلێت، منیش کتوپڕ دەروونم وای لێهات نەمدەتوانی تەماشای بکەم، پشتم لێکرد و وتم ئەی زەینەب پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی ناردووە بۆ داوات.[٦٣٧٣]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) زەینەبی بەهاوسەر گرت، خەڵکی بانگ کرد بۆ نانخواردن، خەڵکیش هاتن و پاش نانخواردنەکە کەوتنە دەمەتەقێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستایەوە وەك ئەوەی پێیان بڵێت برۆن، کەچی خەڵکەکە نەچوون، زۆرێك لە خەڵکەکە ئەوەیان بینی هەستان و چوون، بەڵام سێ کەس دانیشتن و نەچوون، پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ناویانەوە دەبینێت دانیشتون، دواتر هەستان، ئەنەس هەستاو چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و هەواڵی پێدا کە ئەوانیش چون، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) هاتەماڵەوەو منیش ویستم بچمە ژوورەوە، پێغەمبەر (ﷺ) پەردەیەکی لەنێوان من و خۆیدا دانا، ئەوەبوو ئایەتی قورئان دابەزی:

---

٦٣٧١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٦٩.

٦٣٧٢ - السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥٢٥١، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٩٩٧٩، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن النسائي، الرقم ٣٢٥١،

٦٣٧٣ - صحيح مسلم، الرقم ٢٦٤٥.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَـٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَـٰعًا فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّۚ وَمَا كَانَ لَكُمۡ أَن تُؤۡذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزۡوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦٓ أَبَدًاۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ٥٣﴾ الأحزاب: ٥٣).[٦٣٧٤]

**(ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) مەگەر ڕێگەتان پێ بدرێ بۆ نان خواردنێك بێ ئەوەی چاوەڕوانی پێگەیشتنی بکەن بەڵام ئەگەر بانگ کران (بۆ نان خواردن) ئەوسا بڕۆنە ژوورەوە ئینجا ئەگەر خواردنەکەتان خوارد بڵاوەی لێ بکەن وە مەمێننەوە بۆ قسە کردن چونکە بەڕاستی ئەو (مانەوەتان) ئازاری پێغەمبەر (ﷺ) دەدات ئەویش شەرم دەکات لێتان (کە بێ دەنگە) بەڵام خوا لە (وتنی) هەق شەرم ناکات وە هەر کاتێ داوای شتێکی ناو ماڵتان کرد لە (هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ)) ئەوە لە پشتی پەردەوە لێیان داواکەن ئەو (شێوە داواکردنە) تان خاوێنترە بۆ دڵی ئێوەو ئەوانیش بە هیچ شێوەیە بۆ ئێوە دروست نییە ئازاری (دڵی) پێغەمبەری خوا بدەن وە هەرگیز نابێ خێزانەکانی پاش خۆی مارە بکەن بەڕاستی ئەو (ئازاردانی دڵ و مارە کردنە) تان بەلای خواوە (گوناهێکی) زۆر گەورەیە.**

**عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (ئەوەتان خێراتر دێت بۆ لام کە دەستی درێژترە)، ئینجا ئێمەش هەموو دەکەوتینە پێوانەی دەستی یەکدی تا بزانین دەستی کاممان درێژترە، دواجار زانیمان دەستی زەینەب درێژترە چونکە ئەو بە دەستی خۆی کاری دەکرد و خێری زۆری پێ دەکرد،[٦٣٧٥] بەڵام ئەم گێڕانەوەیە بۆ زەینەبی کچی خوزەیمەش هاتووە کە ئەو هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) بوو.**

**بەڵام لە هەندێ گێڕانەوەدا لە بری زەینەب سەودەی کچی زومعە هاتووە.[٦٣٧٦]**

---

٦٣٧٤ - صحيح البخاري، الرقم ٤٥١٧ و اللفظ له، صحيح مسلم، الرقم ٢٦٤٣، صحيح ابن حبان، الرقم ٥٦٥٥، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٣٣١٢.

٦٣٧٥ - صحيح مسلم، الرقم ٤٥٩٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٣٧٣.

٦٣٧٦ - صحيح البخاري، الرقم ١٣٦٥، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٤٣٤٢.

عائیشە و حەفصەی دایکانی باوەڕداران غیرەیەکیان هەبوو بەرامبەر بە هەڵوێستێك کە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ زەینەبی کچی جەحش هەیبوو، حەفصە دوای عائیشەو زەینەبیش دوای حەفصە بوون بە هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) کە دەچوو بۆ لای زەینەب لای ئەو هەنگوینی دەخوارد، عائیشەو حەفصەش بڕیاریاندا پێکەوە کارێك بکەن پێغەمبەر (ﷺ) راگرن لەو خواردنی هەنگوینە، بۆیە بڕیاریان دا پێغەمبەر (ﷺ) بچێت بۆ لای هەرکامیان بڵێن ئەوە مەغافیرت خواردووە (خواردنێکی بۆن ناخۆشە)، ئەو بۆنەت لێ دێت، پێغەمبەریش (ﷺ) کە ئەوەی پێ وترا فەرمووی (نا، بەڵام من لای زەینەبی کچی جەحش هەنگوینم خواردووە، ئیتر هەرگیز نایخۆم و سوێندیشم خواردووە، هەواڵی ئەمەش مەڵێ بە کەس)،[٦٣٧٧] ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ، قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ، وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَنْ بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنْبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ)،[٦٣٧٨] (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆچی شتێك لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت تۆ ڕەزامەندی ژنەکانت دەوێ لە کاتێکدا خوا لێخۆشبووی میهرەبانە، بێگومان خوا دایناوە بۆتان هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتان خوا کارساز و دۆستی ئێوەیە وە ئەو زانای کاردروستە، کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) بەنهێنی لای هەندێ لە ژنەکانی قسەیەکی درکاند ئینجا کە ئەو (ژنە) قسەکەی کرد (بۆ هەوێکەی) خواش پێغەمبەری (ﷺ) ئاگادار کرد (پێغەمبەر (ﷺ)) هەندێك (لە قسەکان) ی باسکرد و بێ دەنگ بوو لە هەندێکی تری ئینجا کە پێی وت (ژنەکەی) وتی: کێ ئەمەی پێ گەیاندی فەرمووی خوای زانای ئاگادار پێی گەیاندم، ئەی (حەفصە و عائیشە) ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خودا (جێ ی خۆیەتی) چونکە بەڕاستی دڵتان لایدا (لە حەق و ڕاستی) وە ئەگەر پشتی یەکتر بگرن لە دژی پێغەمبەر (ﷺ) (سەرکەوتوو نابن) چونکە بێگومان خوا پشگیری ئەوەو هەروەها جوبرەئیل و ئیمانداره چاکەکانیش دوای ئەوان فریشتەکانیش پشتیوانی ئەون).

---

٦٣٧٧ - صحيح البخاري، الرقم ٤٦٣٠.

٦٣٧٨ - صحيح مسلم، الرقم ٢٧٧٢.

## وەستانێك

لە گێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا هەمان بەسەرهات هاتووە، بەڵام وا هاتووە کە خاوەنی هەنگوینەکە حەفصە بووەو پلان دانانەکەش عائیشەو سەودە بون،[٦٣٧٩] بەڵام ئیبن حەجەر لە شەرحی بوخاریدا دەڵێت دەگونجێت ئەو رووداوە جارێکی تر بووبێت و پەیوەست نەبووە بەم رووداوەو بە دابەزینی ئەم ئایەتانەوە، چونکە رووداوی هەنگوینەکەی زەینەب و پێ ناخۆش بوونی عائیشەو حەفصە چەسپاوە، لەو بارەشەوە مشتومڕێکی ورد دێنێت، ئەو پێی وایە کە لەوانەیە رووداوەکەی هەنگوین خواردن لای حەفصە پێش ئەم رووداوە بووبێت و پەیوەست نەبووبێت بەو ئایەتانەوە،[٦٣٨٠] بەڵام ئەمە وردەکاری دەوێت، چونکە ناکرێت پێغەمبەر (ﷺ) دوو جار بە هەمان رووداو تێکەوتبێت، وەك خۆی لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت (لا يلدغ المؤمن من جحر واحد مرتين)،[٦٣٨١] (باوەڕدار دوو جار لە کونێکدا ناگەزرێت)، ناگونجێت پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم جار بەو جۆرەی بەرامبەر کرابێت و بۆ جاری دووەمیش هەمان شتی بەرامبەر کرابێت و هەستی پێ نەکردبێت، دوور بێت لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ئەمە بە لاوازدانانی هەست و پێزانینی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، بۆیە دەکرێت ئەگەرێکی تر هەبێت، ئەویش ئەوەیە دەبێت پێغەمبەر (ﷺ) ئاگادار نەبووبێت بە رووداوی یەکەم و ئەو شتەی بۆ ئاشکرا نەبووبێت تا لە رووداوی دووەمدا ئینجا خوای گەورە ئاشکرای کردبێت، چونکە وەك هاتووە کاتێك هەریەك لە عائیشەو سەودە وا دەڵێن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەویش دەچێتەوە بۆ لای حەفصە، حەفصە دەڵێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو هەنگوینەت بۆ تێبکەم؟ ئەویش دەفەرموێت نا پێویستم نیە، ئینجا سەودە بە عائیشەی وت سوبحانەڵا، بەخوا ئەو هەنگوینەمان لێ حەرام کرد، عائیشەش بە سەودەی وت بێدەنگ بە،[٦٣٨٢] بۆیە نابینین هیچ سوێند خواردنێکی تێدا بووبێت بۆ نەخواردنی و باسی دابەزینی ئایەتەکەشی تێدا نیە.

---

٦٣٧٩ - صحيح مسلم، الرقم ٢٧٧٣.

٦٣٨٠ - فتح الباري، ج٩، ص ٣٧٦ - ٣٧٧.

٦٣٨١ - صحيح البخاري، الرقم ٥٧٨٧، صحيح مسلم، الرقم ٥٤٢٧، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٦٤، سنن أبي داود، الرقم ٤٢٤١، سنن الدارمي، الرقم ٢٧٣١، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٨٧٢٥، المعجم الاوسط للطبراني، الرقم ٦٨٨٩.

٦٣٨٢ - صحيح مسلم، الرقم ٢٧٧٣.

بەهەرحاڵ ئەم رووداوە بەڵگەیە لەسەر بوونی غیرە لای ئافرەتان، وەك دەبینین ئوممو سەلەمەی دایكی باوەڕداران خۆی دان بەوەدا دەنێت و كاتێك پێغەمبەر (ﷺ) داوای دەكات ئەو دەڵێت ئاخۆ من ئافرەتێكم غیرەیەكی زۆرم تێدا هەیە،[٦٣٨٣] هەروەها كاتێك پرسیار دەكرێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆچی ئافرەتێكی پشتیوانان بەهاوسەر ناگریت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێت (إن فيهم غيرة شديدة)،[٦٣٨٤] (ئەوان غیرەیەكی زۆر زۆریان تێدایە).

هەروەك ئەمە بەڵگەیەكی جوان و روونە بۆ موسڵمان تا ئەگەر هەڵەیەكی لە هەر كەسێك بەدی كرد نەیكاتە بیانوو بۆ سفركردنەوە یان شكاندنی ئەو كەسە، چونكە مرۆڤ هەركات جێی هەڵەكردنەو دەكەوێتە هەڵەوە، دەبینین ئەوە هاوسەرانی پێغەمبەری خوان (ﷺ) و دایكانی باوەڕدارانن، كەچی دەكەونە هەڵەوەو تەوبەش دەكەن و خوای گەورەش نایانشكێنێتەوە، بەڵكو پێشنیازی تەوبەیان بۆ دەخاتەڕوو، پێغەمبەریش (ﷺ) هەڵوێستی قورسی نەگرتەبەر بەرامبەریان و كارەكەی جێهێشت بۆ فەرمانی خوا، كەچی دەبینین لە رۆژگاری ئەمڕۆدا موسڵمانانێك هەن چاو دادەخەن لە ئاست هەوڵ و ماندوێتی بانگەواز و جیهاد و رەنجی دەیان یان سەدان بانگخوازی رێی خوادا و بە بینینی هەڵەیەك لە هەر كەسێك لەوانە دەكەونە زەقكردنەوەی هەڵەكەی و شكاندنی و ئیدی بە كەم تەماشاكردنی، جا خۆ ئەگەر وا بوایە دەبوو ئەم ژنانەی پێغەمبەر (ﷺ) لەو ئاستە بەرزەیان داماڵرابان و دەركرابان، بەڵام ئایا خوا و پێغەمبەر (ﷺ) بڕیار و خوێندنەوەیان بۆ باری مرۆیی وایە؟ نەخێر، خوا دایناوە مرۆڤ هەڵە دەكات و تەوبەی لەسەر واجب دەبێت، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (كل بني آدم خطاء و خير الخطائين التوابون)، (هەموو ئادەمیزاد هەڵەكارن و چاكترینی هەڵەكاران تەوبەكارانن)، تەنانەت خوای گەورە دایناوە هەر دەبێت مرۆڤ هەڵە بكات و تەوبەی لێ بكات، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە (والذي نفسي بيده لو لم تذنبوا لذهب الله بكم، ولجاء بقوم يذنبون فيستغفرون الله فيغفر لهم)،[٦٣٨٥] (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئێوە تاوان نەكەن، بە دڵنیاییەوە خوای گەورە ئێوە لادەبات و خەڵكانێك دێنێت كە تاوان دەكەن و ئینجا داوای لێخۆشبوون لە خوا دەكەن و خوای گەورەش لێیان خۆش دەبێت).

---

٦٣٨٣ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٦٠٢٤،

٦٣٨٤ - المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٨٣٦٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥١٩٧، معجم أبي يعلى الموصلي، الرقم ١٦٠.

٦٣٨٥ - صحيح مسلم، الرقم ٥٠٤٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٧٨٧٤.

کاتێك ڕووداوی ئیفك ڕوویدا، زەینەب شایەتی خێری دا بۆ عائیشە، عائیشە دەڵێت: لەناو خێزانەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) زەینەبی کچی جەحش ڕکەبەرم بوو، کە پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بەو مەسەلەیە پرسیاری لێکرد زەینەب وتی بەخوا تەنها خێر دەزانم، ئەوەبوو خوا پاراستی لەو بوهتانە.[٦٣٨٦]

جارێك هەندێ لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کۆبوونەوە تا ناڕەزایی دەرببڕن بەرامبەر بەو خۆشەویستیە زۆرەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هەیبوو بۆ عائیشە، فاطیمەی کچی پێغەمبەریان (ﷺ) نارد بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و تیان پێی بڵێ بۆ خاتری خوا لە خۆشەویستی بۆ عائیشە دادپەروەر بێت، ئەویش چوو و ئەوەی بە پێغەمبەر (ﷺ) وت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کچە ئازیزەکەم ئایا ئەو ئافرەتەت خۆش ناوێت کە من خۆشم دەوێت؟) فاطیمە وتی با، گەڕایەوەو هەواڵەکەی دایەوە بە هاوسەرەکانی تری، ئینجا بڕیاریان دا زەینەبی کچی جەحش بنێرن، زەینەب چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتووڕە بوو و وتی ژنەکانت دەڵێن بۆ خاتری خوا بەرامبەر بە خۆشەویستیت بۆ عائیشە دادپەروەر بە، هێندە دەنگی بەرز کردەوە تا کار گەیشتە ئەوەی قسەیەکی وت بە عائیشە، عائیشەش لەولاوە دانیشتبوو، پێغەمبەر (ﷺ) تەماشایەکی عائیشەی کرد وەك پێی بفەرموێت قسەت نیە؟ عائیشەش کەوتە وەڵامدانەوەی زەینەب تا بێدەنگی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) تەماشایەکی عائیشەی کرد و فەرمووی: ئەوە کچی ئەبووبەکرە.[٦٣٨٧]

حەمنەی خوشکی زەینەب لە مزگەوتی مەدینە لەدوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) نوێژی دەکرد، جارێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینی لەنێوان دوو پایەی مزگەوتدا پەتێك بەستراوە، فەرمووی: ئەو پەتە چیە. وتیان ئەی پێغەمبەر (ﷺ) حەمنەی کچی جەحش تا دەتوانێت بەپێوە نوێژ دەکات، کە توانای نەما خۆی دەگرێت بەو پەتەوە، ئەویش فەرمووی: ( با تا توانای هەیە نوێژ بکات، کە توانای نەما با دابنیشێت)،[٦٣٨٨] بەڵام گێڕانەوەتی تر هاتووە کە دەڵێت: دایکی باوەڕداران زەینەب وایکردووە، ئیبن حەجەر دەڵێت: پێشدەچێت هەردووکیان وایان کردبێت.[٦٣٨٩]

---

٦٣٨٦ - صحيح مسلم، الرقم ٥٠٨٠.

٦٣٨٧ - صحيح البخاري، الرقم ٢٤٦٢.

٦٣٨٨ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٩٧٠، سكت عنه الذهبي، سنن أبي داود، الرقم ١١٣٠، قال الألباني صحيح دون ذكر حمنة.

٦٣٨٩ - فتح الباري، ج٣، ص ٣٦.

زەینەب دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) بە شڵەژاوی خۆی کرد بە ژووردا و فەرمووی: (لا إله إلا الله، ويل للعرب من شر قد اقترب، فتح اليوم من ردم يأجوج ومأجوج مثل هذه)، (هاوار بۆ عەرەب بۆ خراپەیەك کە نزیك بووەتەوە، ئەمڕۆ هێندە—بە دوو پەنجەی ئەڵقەیەکی دروست کرد— لە بەنداوەکەی یەئجووج و مەئجووج کراوەتەوە)، منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جا تا کاتێك پیاوچاکانمان لەناودا بن لەناو دەچین؟ فەرمووی: (نعم إذا كثر الخبث)،[6390] (بەڵێ ئەگەر پیسی زۆر بوو)

پێغەمبەر (ﷺ) لە دەستکەوتەکانی غەزای خەیبەر سەد کۆڵ خورمای بڕیەوە بۆ زەینەبی کچی جەحش.[6391]

پێغەمبەر (ﷺ) پێش وەفاتی لە ماڵی زەینەب بوو، ڕۆژی چوارشەممە بوو، نۆزدەی مانگی صەفەری ساڵی یانزەی کۆچی بوو، پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی زەینەب بوو، پێغەمبەر (ﷺ) تووشی ئازارێکی زۆر بوو، ئەوەبوو هەموو هاوسەرەکانی تری پێغەمبەر (ﷺ) هاتن بۆ ئەویێ و لەلای کۆبوونەوە.[6392]

جارێك عومەری کوڕی خەططاب مووچەکەی زەینەبی نارد بۆی، ئەویش وتی خوا لە عومەر خۆش بێت، کەسی تر هەیە لە من شیاوترە بەم هەمووە، پێیان وت ئەوە هەمووی بۆ تۆیە، وتی سوبحانەڵا، ئینجا بە پارچە قوماشێك داپۆشی و وتی داپۆشن و جلێکی پێدا بدەن، ئینجا کەوتە دابەشکردنی بەسەر خزمانی خۆی و هەتیواندا، دواتر دەستەکانی بەرز کردەوەو وتی خوایە دوای ئەمساڵ جارێکی تر مووچەی عومەرم بۆ نەیەت.[6393]

زەینەب کە نەخۆش کەوت و سەرەمەرگی هات، بەوانەی دەوروبەری وت من کفنی خۆمم ئامادە کردووە، جا ئەگەر عومەر کفنی بۆ ناردم یەکێکیان بکەن بەخێر، یان ئەوەی خۆم یان ئەوەی عومەر.[6394]

---

٦٣٩٠ - صحيح البخاري، الرقم ٣١٨٤،

٦٣٩١ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٥.

٦٣٩٢ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٢٥٥.

٦٣٩٣ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٢.

٦٣٩٤ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٧.

زەینەب لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططاب و لە ساڵی بیستی کۆچیدا وەفاتی کرد،[٦٣٩٥] بەوەش یەکەم هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) بوو دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد.[٦٣٩٦]

کاتێك زەینەب وەفاتی کرد، عومەر فەرمانی کرد کەسێك هاوار بکات تەنها کەسە مەحرەمەکانی بچن بۆ لای تەرمەکەی، ئینجا کچەکەی عومەیس وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆ شتێکت پێ نەڵێم کە ئەزموونی خەڵکی حەبەشە بوو لەگەڵ ژنەکانیان، ئینجا تابووتێکی ئامادە کرد و بە جلێك دایپۆشی، عومەریش وتی شتێکی زۆر باشە، عومەر فەرمانی کرد بە کەسێك هاواری کرد لەگەڵ تەرمی دایکتان بچنە دەرەوە.[٦٣٩٧]

دواتر عومەری کوڕی خەتتاب نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد، ئینجا برا بۆ گۆڕستانی بەقیع و لەوێ ئەسپەردە کرا.[٦٣٩٨]

---

٦٣٩٥ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٢.

٦٣٩٦ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٢٠١.

٦٣٩٧ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٣.

٦٣٩٨ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٤٩.

## (ئوم كەلسوم )

ئوم كەلسوم كچی پێغەمبەری خوایە (صلى الله علیه وسلم ) لە خەدیجەی كچی خوەیلید، لەتەمەندا گەورەترە لە (زەینەب و روقیە)، ئوم كەلسوم ئەمە كونیەكەیەتی و مێژوو نوسان ئاماژەیان بە ناوی خۆی نەداوە كە چیە، لەدایك بووە لە پێش هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم ) بە شەش ساڵ، موسوڵمان بووە و هیجرەتیشی كردووە بۆ مەدینە، لە ساڵی ٩ كۆچی كە خێزانی عوسمانی كوری عەفان بووە لە تەمەنی ٢٧ ساڵیدا وەفاتی كردووە.

### ژیانی:

ئوم كەلسوم لە مەككە لە دایك بووە لە ساڵی ٦٠٤ زاینی واتە ١٩ ساڵ پێش هیجرەت، ئەو كاتەی ئوم كەلسوم لەدایك بووە تەمەنی پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم ) ٣٤ ساڵ بووە، شوی كردووە بە ئامۆزای خۆی (عوتەیبەی كوڕی ئەبولەهەب)، كاتێكی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم ) وەحی بۆهات ئوم كەلسوم موسوڵمان بوو، كاتێك كە سورەتی المسد دابەزی كە زەمی ئەبولەهەب دەكات، ئالەم كاتەدا ئەبولەهەب كوڕەكەی ناچار كرد كە ئوم كەلسوم تەڵاق بدات.

هیجرەتی كردووە بۆ مەدینە لەگەڵ فاتیمەی خوشكی، پاشان شوو دەكات بە عوسمانی كوڕی عەفان لە ساڵی ٣ كۆچیدا، لە دوای ئەوەی روقیەی خوشكی كە خێزانی عوسمان دەبێت و وە فات دەكات لە ساڵی ٢ كۆچی، لە پێش ئەوەی عوسمانی كوڕی عەفان ئوم كەلسوم مارە بكات عومەری كوڕی خەتاب پێشنیاری حەفصەی كچی دەكات بۆ عوسمان بەڵام عوسمان بێدەنگی هەڵدەبژێرێ چونكە لە پێغەمبەری بیستبوو كە بەنیازە حەفصە مارەبكات، كاتێك عوسمان كوڕی عەفان ئوم كەلسومی مارە كرد پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم ) فەرمووی: هاوسەرگیری عوسمان و ئوم كەلسوم بە وەحی بووە.

### وەفاتی:

ئوم كەلسوم لە مانگی شەعبانی ساڵی ٩ كۆچی وەفات دەكات لە شاری مەدینە لە گۆڕستانی بەقیع بەخاك دەسپێرێ و پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم ) لەسەر قەبرەكەی دادەنیشێت و چاوەكانی پڕگریان دەبێت بۆی، پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم ) بۆخۆی دادەبەزێتە ناو قەبرەكەیەوەو بەخاكی دەسپێرێ...

## فاطیمهی زەهرا ؓ (رضي الله عنها)

ناوی فاطیمەی کچی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵایە، باوکی سەرداری مرۆڤایەتی و ئازیزی ئیماندارانە، موحەممەدی نێردراوی خوایە.[١٠٤٩٢]

دایکی ناوی خەدیجەی کچی خوەیلیدە، دایکی باوەڕداران و موژدەپێدراوی بەهەشت و یەکەم و خۆشەویسترین هاوسەری پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، پێشتر لە پیتی (خ) دا بە وردی ژیانەکەیمان باسکردووە.

فاطیمە سێ خوشکی هەبوو بە ناوەکانی روقییەو زەینەب و ئومموکلثوم کە پێشتر ژیانی هەرکام لەوانمان باسکردووە.

زەینەب کە کچە گەورەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، بەڵام لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.[١٠٤٩٣]

روقییە کە ژنی عوثمانی کوڕی عەففان بوو، کاتێك غەزای بەدر روویدا روقییە نەخۆش بوو، بۆیە بە ویستی پێغەمبەر (ﷺ) عوثمان لای روقییە مایەوە، بەڵام پێش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بگاتەوە ناو مەدینە روقییە کۆچی دوایی کرد.[١٠٤٩٤]

ئومموکلثوم کە لە روقییە بچووکتر بوو و دوای مردنی روقییەی خوشکی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی مارە کرد لە عوثمانی کوڕی عەففان، بەڵام ئەمیش لە ساڵی نۆی کۆچیدا وەفاتی کرد و باوکی (پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)) نوێژی لەسەر کرد.[١٠٤٩٥]

---

[١٠٤٩١] - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ٥٠.

[١٠٤٩٢] - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ٤، ص ١٨٩٣.

١٠٤٩٣ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٤٤.

١٠٤٩٤ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٢٦.

براکانی فاطیمە بریتی بوون لە قاسم کە برا گەورەی بوو، طەیب، طاهیر، عەبدولا،[١٠٤٩٦] برایەکی تری هەبوو بە ناوی ئیبراهیم کە لە رووی باوکیەوە بوو و دایکیان جیا بوو، ئیبراهیمیش لەساڵی هەشتەمی کۆچیدا لەدایك بوو و پاش هەژدە مانگ هەر بە منداڵی کۆچی دوایی کرد،[١٠٤٩٧] جا هەموو کوڕەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خەدیجەوە پێش دابەزینی سروش وەفاتیان کرد، بەڵام کچەکانی مانەوە تا ئیسلام هات و باوەڕیان هێنا بە ئیسلام و لەگەڵ باوکیان کۆچیان کرد بۆ مەدینە.[١٠٤٩٨]

مێردەکەی فاطیمە ناوی عەلی کوڕی ئەبووطالیبە، ئامۆزاو زاوای پێغەمبەر (ﷺ) و موژدەپێدراوی بەهەشت و مەولا موسڵمانان و خەلیفەی چوارەمی باوەڕدارانە، پێشتر لە پیتی (ع) دا ژیانەکەیمان باسکردووە.

فاطیمە کوڕێکی هەبوو بە ناوی حەسەن کە کوڕە گەورەی بوو، حەسەنی رەیحانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گەورەی گەنجانی بەهەشت و رێبەری چاکسازی نێوان دوو دەستەی موسڵمانان و خەلیفەی پێنجەمی راشیدینە، پێشتر لە پیتی (ح) دا ژیانەکەیمان باسکردووە.

کوڕێکی تری ناوی حوسەینە، حوسەینی رەیحانەی پێغەمبەر (ﷺ) و گەورەی گەنجانی بەهەشت و خۆشەویستی پێغەمبەری خواو هەمو کەسێکی ئیمان لەدڵە، پێشتر لە پیتی (ح) دا ژیانەکەیمان باسکردووە.

کوڕێکی تری ناوی موحسین بوو کە لە فەرموودەیەکدا باسی هاتووەو پێشتر لە باسی ژیانی حەسەن و حوسەیندا باسمان کردووە.

کچێکی هەبوو بە ناوی ئوممولکلثوم کە لە ساڵی شەشی کۆچی لەدایك بوو.[١٠٤٩٩]

---

١٠٤٩٥ - أسد الغابة، ج٧، ص ٤٢١.

١٠٤٩٦ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٤.

١٠٤٩٧ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٧٢.

١٠٤٩٨ - أسد الغابة، ج٧، ص ٩١.

١٠٤٩٩ - سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٥٠٠.

کچێکی تری هەبوو بە ناوی زەینەب کە ئەمیش کچەزای پێغەمبەر (ﷺ) بوو، لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لەدایك بوو، زەینەب لەگەڵ حوسەینی برایدا چوو بۆ کەربەلا، کاتێك حوسەینی برای شەهید کرا، زەینەب–هاودەم بەو ژن و منداڵانەی کە مابوون– برا بۆ دیمەشق.[1050]

## لەدایکبوونی:

سەبارەت بە کاتی لەدایکبوونی راجیایی هەیە، رایەك دەڵێت فاتیمە پێنج ساڵ پێش دابەزینی سروش لەدایك بووە، رایەکیش دەڵێت بەڵکو لە ساڵی دووەمی پێغەمبەرایەتیدا لەدایك بوو.[1051]

ذەهەبی دەڵێت لەدایکبوونی فاطیمە کەمێك پێش دابەزینی سروش بوو بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ).[1052]

سەبارەت بەوەی ئایا کچەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کامیان گەورەتر بوون، یەکدەنگی هەیە کە زەینەب کچە گەورە بووە، دواتر راجیایی هەیە، رایەك دەڵێت فاتیمە کچە بچووك بووە، رایەك دەڵێت روقییە کچە بچووك بووە، رایەکیش دەڵێت بەڵکو ئومموکلثوم کچە بچووك بووە.[1053]

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککە بوو و بانگەوازی دەکرد، هێشتا فاطیمە بچووك بوو، پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی بۆ دابەزی (و أنذر عشيرتك الأقربين)، پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکی قورەیشی کۆکردەوەو ئاگاداری کردنەوەو فەرمووی (ئەی بەنی کەعبی کوڕی لوئەی، خۆتان لە دۆزەخ رزگار بکەن... ئەی فاطیمە، خۆت لە دۆزەخ رزگار بکە، چونکە من لای خوا هیچم پێ ناکرێ بۆتان)،[1054] (ئەی فاطیمەی چی موحەممەد چەندە لە سامانی منت دەوێت داوای بکە، بەڵام لای خوا هیچم پێ ناکرێت بۆت).[1055]

---

١٠٥٠٠ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٤٦.

[1051] -الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ٥٤.

[1052] - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٩.

١٠٥٠٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٨.

[1054] - صحيح مسلم، الرقم ٣٢٩،

[1055] - صحيح البخاري، الرقم ٢٦٢١.

## کۆچکردن بۆ مەدینە

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، پاش ماوەیەك زەید و ئەبوورافیعی بە دوو وشترەوە نارد بۆ مەککە تا فاتیمەو ئوممولکلثوم و سەودەی کچی زەمعەو ئوممولئەیمەن و ئوسامەی کوڕی زەید بهێنن بۆ مەدینە.[١٠٥٠٦]

عائیشە دەڵێت دوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، زەیدی کوڕی حارثەی نارد بۆ لامان و ئەبوورافیعی مەولاشی لەگەڵدا نارد، دوو وشتر و پێنج سەد درهەمی پێدان تا بۆ کۆچەکە چی وشتریان پێویستە بیکڕن، ئەبووبەکریش عەبدولای کوڕی ئورەیقیطی بە دوو یان سێ وشترەوە نارد و نامەیەکی نووسی بۆ عەبدولای کوڕی ئەبووبەکر و فەرمانی پێدەکرد دایکی و من و ئەسمائی خوشکم بەودا بنێرێت بۆ مەدینە، ئەوەبوو کەوتنەڕێ، لەنیوەی ڕێدا زەید بە پارەکە سێ وشتری کڕی، دواتر هەموویان هاتنە مەککەو ڕێیان کەوتە طەلحەی کوڕی عوبەیدولا کە دەیویست خێزانی ئەبووبەکر ببات بۆ مەدینە، ئەوەبوو هەموومان کەوتینەڕێ، زەید و ئەبوورافیع فاطیمە و ئوممولکلثوم و سەودەی کچی زەمعەیان هێنان، هەروەها زەید ئوممولئەیمەن و ئوسامەی کوڕی زەیدی هێنا، عەبدولای کوڕی ئەبووبەکریش دایکم و من و ئەسمائی هێنا، طەلحەش هاودەم بە ئێمە هات و هەموو پێکەوە کەوتینەڕێ تا گەیشتینە مەدینە، ئەو کات موسڵمانان خەریکی دروستکردنی مزگەوتی مەدینە بوون.[١٠٥٠٧]

## هاوسەرگیری عەلی و فاطیمە

هاوسەرگیری عەلی کوڕی ئەبووطالیب و فاطیمەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) لە مانگی ذیلقەعدە یان کەمێك پێش مانگی ذیلقەعدەی ساڵی دووەمی کۆچیدا بوو، واتە لە پاش جەنگی بەدر.[١٠٥٠٨]

عەلی کوڕی ئەبوطالیب دەڵێت خزمەتکارێکم وتی دەزانیت فاطیمە داواکراوە؟ وتم نا، وتی با، ئەی بۆ تۆ ناچیتە داوای؟ منیش وتم خۆ هیچم نیە تا بچمە داوای، ئەویش وتی ئەگەر بچیت بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) فاطیمەت پێ دەدات، هێندەی پێ وتم تا منیش چووم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، کە چوومە ئەوێ و لەبەردەمیدا دانیشتم نەمتوانی هیچ بڵێم، فەرمووی بۆچی هاتویت؟ ئیشێکت هەیە؟ منیش بێدەنگ

---

١٠٥٠٦ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٦٩.

١٠٥٠٧ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٧٥٥.

١٠٥٠٨ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١١٩.

بووم، هەمدی لێی دووبارە کردمەوە و بێدەنگ بووم، ئەویش فەرمووی (لەوانەیە هاتبیت بۆ داوای فاطیمە؟) وتم بەڵێ، فەرمووی ئەی هیچت هەیە بۆمارەییەکەی؟ وتم نا بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرمووی ئەی چیت کرد بە قەڵغانەکەت کە پێم دایت، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەو قەڵغانە زۆر قورس و پتەو بوو، منیش وتم لای خۆمە، فەرمووی (دەی لێم مارە کردیت، ئەو قەڵغانەی بۆ بنێرە تا بەوە حەڵاڵ بێت بۆت).[١٠٥٠٩]

کاتێك عەلی ویستی هاوسەرگیری لەگەڵ فاتیمە بکات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هیچت هەیە؟ عەلی وتی هیچم نیە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی قەڵغانە قورسەکەت کوا؟ وتم لای خۆمە، ئەوەبوو ئەو قەڵغانەی دا بە فاتیمە.[١٠٥١٠]

کاتێك عەلی کوڕی ئەبوطالیب فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بە هاوسەر گرت، بۆ ماڵێك دەگەڕا تا تیایدا نیشتەجێ بێت، بەڵام خانوویەکی دوور لە ماڵی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەست کەوت و لەوێ گواستیەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ ماڵیان و پێی فەرموون دەیەوێت نزیکیان بکاتەوە لە ماڵی خۆی، فاطیمەش وتی داوا لە حارثە بکە تا شوێنەکەی بگۆڕێتەوە لەگەڵمان تا نزیك بینەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (حارثە هێندە شوێنی خۆی بۆ چۆڵکردوین ئیتر رووم نایەت پێی بڵێم)، حارثە ئەوەی بیستەوەو و هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیستوومە دەتەوێت فاطیمە لێتەوە نزیك بێت و ئەوەش خانووەکانی منن، من خۆمو ئەوەشی هەمە بۆ خوا و پێغەمبەری خوایە، سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی تۆ لێم وەردەگریت لام زۆر خۆشترە لەوەی وازی لێ دێنیت بۆم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (راست دەکەیت، خوا بەرەکەت بڕژێت بەسەرتدا)، ئەوەبوو فاطیمە هاتە ناو خانوویەکی حارثە کە نزیك مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، حارثە لە نزیك مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) چەند خانوویەکی هەبوو، هەر جارەو یەکێك لەو خانووانەی چۆڵ دەکرد بۆ خۆشەویستێکی پێغەمبەر (ﷺ) تا هەموو خانووەکانی ئەو شوێنەی دا بە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوسەرەکانی.[١٠٥١١]

---

١٠٥٠٩ - دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٠٢٠.

١٠٥١٠ - السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥٤٠٨، السن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٣٤٢١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٨٣، قال الألباني في صحيح و ضعيف سنن النسائي، الرقم ٣٣٧٥ حسن صحيح.

١٠٥١١ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٦٦.

گواستنەوەی فاطیمە لە دوای غەزای ئوحود بوو،[١٠٥١٢] ئەوکات تەمەنی نزیکەی پانزە ساڵ و پێنج مانگ بوو.[١٠٥١٣]

لە غەزای ئوحوددا کە پێغەمبەر (ﷺ) بریندار بوو، فاطیمەی چی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و عەلی کوڕی ئەبووطالیب برینەکەی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) دەشۆرد، عەلی ئاوی دەکرد بە دەستی فاطیمەدا و فاطیمەش برینەکەی دەشۆرد، فاطیمە کە زانی برینەکە بەردەوام خوێنی لێ دەڕوات، پارچە حەصیرێکی هێنا و سووتاندی و دای لە برینەکە، ئیتر خوێنەکە وەستا.[١٠٥١٤]

## لەدایکبوونی حەسەن

پێش لەدایك بوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیزانی کە فاطیمەی کچی منداڵی دەبێت، ئەوەتا ئوممولفەضل دەڵێت شەوێك خەوم دی بەشێك لە جەستەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ماڵی مندایە، منیش ترسام و راچڵەکیم، ئینجا هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خەوەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی (خيرا رأيت، تلد فاطمة غلاما، فتكفلينه بلبن ابنك قثم)، (خەوی خێرت دیوە، فاطیمە منداڵێکی دەبێت و تۆیش دەیگریتە خۆ و دایەنی دەکەیت و لە شیری قوثەمی کوڕت دەدەیت پێی)، ئوممولفەضل دەڵێت ئەوەبوو حەسەن لەدایك بوو، هێنرا بۆمو شیرم پێدەدا تا کەوتە گاگۆڵکێ، ئینجا هێنام بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و لە ژوورەکەیدا دامنیشاند، حەسەن میزی کرد، منیش دام لەنێوان هەردوو شانی، پێغەمبەر (ﷺ) پێی ناخۆش بوو و فەرمووی (لەگەڵ کوڕەکەم نەرمونیان بە رەحمەتی خوات لێ بێت، کوڕەکەمت ئازار دا)، منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جلەکەت لابەرە و جلێکی تر بپۆشە تا ئەوەت بۆ بشۆم، ئەویش فەرمووی (إنما يغسل بول الجارية و ينضح بول الغلام)،[١٠٥١٥] (میزی کچ بێت جل دەشۆردرێت، ئەگەر میزی کوڕ بوو ئاوپرژێن دەکرێت).

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی بیست فاطیمەی کچی منداڵی بووە خێرا چوو بۆ ماڵیان، فەرمووی (أروني ابني ما سميتموه)،(ئادەی کوڕەکەمم نیشان بدەن، ناوی چیتان لێ ناوە؟) عەلی کوڕی ئەبوو

---

١٠٥١٢ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٩.

١٠٥١٣ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٢٨.

١٠٥١٤ - صحيح البخاري، الرقم ٣٨٦٥، صحيح مسلم، الرقم ٣٤٣٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٦٨٣.

١٠٥١٥ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٦٢٧٦ و اللفظ له، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٤٧٧، صححه شعيب الأرناؤوط.

طالیبیش وتی ناوم ناوه حەرب، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بل هو حسن)،[10516] (بەڵکو با ناوی حەسەن بێت)، بەوە ناوی نرا حەسەن.

ئەبی رافع دەڵێت: کاتێك حەسەن لەدایك بوو، فاطیمە چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی گوێزەبانەیەك نەکەم بۆ کوڕەکەم؟ ئەویش فەرمووی (لا ولكن احلقي رأسه ثم تصدقي بوزن شعره من فضة على المساكين أو الأوفاض)، (نا، بەڵام سەری بتاشەو بە کێشی مووە تاشراوەکانی لە زیو بکە بە خێر و بیدە بە هەژاران و ئەو هاوەڵانەی لە مزگەوتن و دەستکورتن یان ئەهلی صوففە)، فاطیمەش چوو ئەوەی کرد.[10517]

بە پێی گێڕانەوەیەك لە رۆژی حەوتەمی لە دایکبوونیدا حەسەن خەتەنە کراوە، جابیر دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) لە رۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی حەسەن و حوسەینیشدا خەتەنەی کردون.[10518]

پێشتر لە ژیانی حەسەنی کوڕی عەلیدا خۆشەویستی پێغەمبەری خوامان (ﷺ) بۆ حەسەن باسکردووەو لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە.

جارێك فاطیمە لای باوکی سکاڵای کرد کە لەدەست کار و هەویر شێلان چی بە دەستەکانی هاتووە، ئەوەبوو پاش ماوەیەك بڕێ دیل هێنران کە ئافرەتیشی تێدا بوو، فاطیمە چوو تا داوای خزمەتکارێك بکات، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) لەوێ نەبوو، بۆیە بە عائیشەی وت تا بە پێغەمبەر (ﷺ) بڵێت، کە پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە، عائیشە پێی وت فاطیمە بۆ شتێکی لەو جۆرە هاتووە، پێغەمبەریش (ﷺ) چوو بۆ ماڵەوەو عەلی و فاطیمەش لە جێگەدا بوون، ویستیان هەستن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی لە شوێنی خۆتاندا بن، ئینجا هات و لەلایان دانیشت، فەرمووی (ألا أدلكما على خير مما سألتما، إذا أخذتما مضاجعكما فسبحا ثلاثا وثلاثين، واحمدا ثلاثا وثلاثين، وكبرا أربعا وثلاثين، فهو

---

[10516] - صحيح ابن حبان، الرقم ٧٠٦٨، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٧٢٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١١١٤١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٧٤٦، ضعفه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٣٧٠٦، لكن حسنه شعيب الأرناؤوط، و صححه الذهبي في التلخيص.

١٠٥١٧ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٦٥٦٦، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٢٣٧٢٢، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٩١٣، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٧٩٤٥، ضعفه شعيب الأرناؤوط، و قال الألباني: وهذا إسناد حسن لولا أن شريكا وهو ابن عبد الله القاضى سيء الحفظ لكنه لم يتفرد به.

[10518] - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٣٢٢، المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٦٨٢٦.

خير لكما من خادم)،[١٠٥١٩] (ئايا شتێكی باشتر لەوەتان پێ نیشان نەدەم كە داواتان كردبوون، كە چوونە ناو جێگەكەتان سی و سێ جار سوبحانەڵا و سی و سێ جار الحمد لله و سی و چوار جار الله أكبر بكەن، ئەوە زۆر بۆتان باشترە لە خزمەتكارێك).

## لەدایكبوونی حوسەین:

تەنها چەند شەوێك لە شەعبانی ساڵی چوارەمی كۆچی تێپەڕ بووبوو كە حوسەین لەدایك بوو، ئەویش پێنج شەو، واتە لە پێنجی شەعبانی ساڵی چوارەمی كۆچیدا بوو، رایەكی تریش دەڵێت بەڵكو لە دوای شەش ساڵ و پێنج مانگ و پانزە رۆژ لە كۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مەدینە لەدایك بووە.[١٠٥٢٠]

حوسەینی كوڕی عەلی ساڵێك و دە مانگ پاش لەدایكبوونی حەسەنی برای لەدایك بوو.[١٠٥٢١]

كە حوسەین لەدایك بوو، عەلی هەمدی ناوی نا حەرب، پێغەمبەر (ﷺ) هات و فەرمووی (أروني ابني ما سميتموه)،(ئادەی كوڕەكەمم نیشان بدەن، ناوی چیتان لێ ناوە؟) عەلی كوڕی ئەبوو طالیبیش وتی ناوم ناوە حەرب، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بل هو حسين)،[١٠٥٢٢] بەڵكو ناوی حوسەینە.

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) حوسەینیشی زۆر خۆشدەویست، پێشتر لە ژیانی حوسەینی كوڕی عەلیدا خۆشەویستی پێغەمبەری خوامان (ﷺ) بۆ حوسەین باسكردووەو لێرەدا دووبارەی ناكەینەوە.

رۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) لەماڵی عائیشە دەرچوو و دای بە لای ماڵی فاطیمەی كچیدا، تەماشای كرد حوسەین دەگری، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەرێ نازانیت گریانی حوسەین ئازارم دەدات؟![١٠٥٢٣]

عەلی بە دایكی دەوت دایە گیان تۆ ئیشوكاری فاطیمە لە دەرەوە بكە، فاطیمەش ئیشی ماڵەوەو هەویر و نان ئامادە كردن لەبری تۆیش دەكات.[١٠٥٢٤]

---

١٠٥١٩ - صحيح البخاري، الرقم ٢٩٦٢، صحيح مسلم، الرقم ٥٠١٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٥٦٠١، سنن أبي داود، الرقم ٤٤٢٤.

١٠٥٢٠ - أسد الغابة، ج٢، ص ٢٦.

١٠٥٢١ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩٣.

١٠٥٢٢ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧٠٦٨، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٧٢٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١١١٤١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٧٤٦، ضعفه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٣٧٠٦، لكن حسنه شعيب الأرناؤوط، و صححه الذهبي في التلخيص.

١٠٥٢٣ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٧٧٨.

**جارێك حەسەن و حوسەینی کوڕانی عەلی نەخۆش کەوتن، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ سەردانیان و خەڵکیش تریش هاتن بۆ لایان، وتیان ئەی ئەبولحەسەن بۆچی نەزرێك ناکەیت بۆ منداڵەکانت؟ ئەویش وتی نەزر بێت ئەگەر چاك ببنەوە سێ ڕۆژ وەك شوکرانە ڕۆژوو بگرم بۆ خوا، فاطیمەش هەر وای وت، فیضضەی نوبییەش وتی نەزر بێت لەسەرم ئەگەر ئەم دوو گەورەی من چاك ببنەوە، وەك شوکرانە بۆ خوا ڕۆژوو بگرم، ئەوەبوو هەردووکیان چاك بوونەوەو بنەماڵەی پێغەمبەر (ﷺ) هیچیان لا نەبوو، عەلی چوو بۆ لای شەمعوونی خەیبەری و سێ مشت گەنمی لێ قەرز کرد و فاطیمەش مشتێکی کرد بە ئارد و شێلای و کردی بە نان، عەلی لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی کرد و دواتر هاتەوە ماڵەوە، نان دانرا و هەژارێك هاتە بەردەرگا و داوای نانی کرد، عەلی فەرمانی کرد نانەکەی پێدرا، ئیتر ئەو شەوو ڕۆژە بە برسێتی مانەوەو تەنها ئاویان دەخواردەوە، بۆ ڕۆژی دووەم هەمدی فاطیمە نانی ئامادەکرد و لە کاتی نانخواردن هەژارێك کە کوڕە شەهیدێکی کۆچەری بوو هاتە بەر دەرگا و داوای نانی کرد و هەمدی نانەکەیان بەویش دا و بە برسێتی مانەوە، بۆ ڕۆژی سێیەم هەمان شت ڕوویدا و نانەکەیان دا بە هەژارێکی تر و خۆیان بە برسێتی مانەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ لایان و بینی حاڵیان چۆنە، ئەوەبوو ئایەتی خوا دابەزی** (هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ۝١ ... وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ۝٨ إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ۝٩)[١٠٥٢٥].

**سەهل دەڵێت جارێك پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ ماڵی فاطیمەی کچی و تەماشای کرد عەلی لەوێ نیە، فەرمووی کوا ئامۆزاکەت؟ فاطیمە وتی دەمەبۆڵەیەکمان بوو و تووڕەی کردم، دواتر چوویە دەرەوەو هیچی پێ نەوتم، پێغەمبەر (ﷺ) بە یەکێکی فەرموو بڕۆ بزانە لە کوێیە؟ کابرا چوو تەماشای کرد لە مزگەوتەو ڕاکشاوە و عەباکەی ژێری لاچووەو خۆڵاوی بووە، پێغەمبەر (ﷺ) بە دەستەکانی خۆڵەکەی لێ دەتەکاند و فەرمووی (هەستە ئەی ئەبووتوراب، هەستە ئەی ئەبووتوراب).[١٠٥٢٦]**

**کاتێك ڕوقییەی خوشکی وەفاتی کرد، ژنان بۆ مەرگی ڕوقییە دەگریان و عومەری کوڕی خەتتابیش ڕێگری دەکرد لێیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: وازبێنە ئەی عومەر، پاشان فەرمووی:**

---

[١٠٥٢٤] - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٢٥.

[١٠٥٢٥] - أسد الغابة، ج٧، ص ٢٥٧.

١٠٥٢٦ - صحيح البخاري، الرقم ٤٣٢.

(إياكن ونعيق الشيطان، فإنه مهما يكون من العين والقلب فمن الرحمة، وما يكون من اللسان واليد فمن الشيطان)، (خۆدوور بگرن له قیژەی شەیتان، چونکە تا لە چاو و دڵەوە بێت ئەوە لە رەحم و سۆزەوەیە، ئەوەش لە زمان و دەستەوە بێت ئەوە لە شەیتانەوەیە)، فاطیمەی خوشکی لە کەناری گۆڕی روقییەوە بۆ روقییەی خوشکی دەگریا، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) بە لایەکی جلەکەی فرمێسکی چاوانی فاطیمەی دەسڕی.[١٠٥٢٧]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: بەیانیەك پێغەمبەر (ﷺ) چوویە دەرەوەو جلێکی خوری لەبەر بوو کە لە مووی رەش دروستکرابوو، ئینجا حەسەنی کوڕی عەلی هات و پێغەمبەر (ﷺ) هێنایە ژوورەوە، دوای ماوەیەکی تر حوسەین هات و لەگەڵی هاتە ژوورەوە، دواتر فاتیمە هات و پێغەمبەر (ﷺ) ئەویشی هێنایەژوورەوە، ئینجا عەلیش هات و پێغەمبەر (ﷺ) ئەویشی هێنایە ژوورەوە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە(إنما يريد الله ليذهب عنكم الرجس أهل البيت و يطهركم تطهيرا).[١٠٥٢٨]

عەلی کوڕی ئەبووطالیب کاتێك کە فاطیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ) ژنی بوو چووە داوای جوەیریەی کچی ئەبووجەهل، ئەوەبوو بەنوموغیرە هاتن داوای مۆڵەتیان کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەو مەسەلەیە، پێغەمبەریش (ﷺ) مۆڵەتی نەدان و فەرمووی (فاتیمە بەشێکە لە من و ئەو شتەی ئەو ئازار دەدات منیش ئازار دەدات).[١٠٥٢٩]

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (سوێند بەخوا کچی پێغەمبەری خوا و کچی دوژمنی خوا لای یەك پیاو کۆ نابنەوە)، ئەوەبوو عەلی کوڕی ئەبووطالیب کە ئەمەی بیست کشایەوە و نەیهێنا.[١٠٥٣٠]

ثەوەبان دەڵێت جارێك فاطیمە هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و منیش لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووم، فاطیمە زنجیرێکی زێڕی لە گەردن کردبوو، وتی ئەمە دیاری ئەبووحەسەنە بۆم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (يا فاطمة أيسرك أن يقول الناس فاطمة بنت محمد وفي يدك سلسلة من نار)، ئەی

---

١٠٥٢٧ - مسند الطيالسي، الرقم ٢٨٠٧، قال الذهبي هذا منكر.

١٠٥٢٨ - صحيح مسلم، الرقم ٤٥٥٤، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣١٤٦٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٢٦٦٢.

١٠٥٢٩ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٦٢.

١٠٥٣٠ - صحيح البخاري، الرقم ٣٥٤٤، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٨٩، سنن ابن ماجة، الرقم ١٩٩٥، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٣٨٣٧، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٥٢٧، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٦٨٤٤.

فاطیمە پێت خۆشە خەڵکی بەناوی فاطیمەی کچی موحەممەد بانگت بکەن و زنجیرێکی ئاگرینیش لە دەستتدا بێت؟ ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) چوویە دەرەوەو دانەنیشت، فاطیمەش زنجیرەکەی برد و کۆیلەیەکی پێ کڕی و کۆیلەکەی ئازاد کرد، پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەوەی بیستەوە فەرمووی (الحمد لله الذي نجى فاطمة من النار)،[10531] (سوپاس بۆ خوا کە فاطیمەی لە دۆزەخ رزگار کرد).

شوعەیب ئەرنائووط دەڵێت: ئەم فەرموودەیە یان پێش دابەزینی فەرزی زەکاتە، یان مەبەستی ئەوەیە بۆ کەشخەو فشە دروست نیە، یان لەبەرئەوەی زەکاتی نەدرابێت، یان لەترسی ئەوەی نەبادا سەرقاڵی بکات لە کاروباری دین و ئەمە تایبەت بێت بە فاطیمە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەهلوبەیتی لەسەر عەزیمەت و چاکترین و باشترین رادەهێنا.[10532]

جارێك هەندێ لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کۆبوونەوە تا ناڕەزایی دەربڕن بەرامبەر بەو خۆشەویستیە زۆرەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هەیبوو بۆ عائیشە، فاطیمەی کچی پێغەمبەریان (ﷺ) نارد بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و تیان پێی بڵێ بۆ خاتری خوا لە خۆشەویستی بۆ عائیشە دادپەرەوەر بێت، ئەویش چوو و ئەوەی بە پێغەمبەر (ﷺ) وت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کچە ئازیزەکەم ئایا ئەو ئافرەتەت خۆش ناوێت کە من خۆشم دەوێت؟) فاطیمە وتی با، گەڕایەوەو هەواڵەکەی دایەوە بە هاوسەرەکانی تری، ئینجا بڕیاریان دا زەینەبی کچی جەحش بنێرن، زەینەب چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتووڕە بوو و وتی ژنەکانت دەڵێن بۆ خاتری خوا بەرامبەر بە خۆشەویستیت بۆ عائیشە دادپەروەر بە، هێندە دەنگی بەرز کردەوە تا کار گەیشتە ئەوەی قسەیەکی وت بە عائیشە، عائیشەش لەولاوە دانیشتبوو، پێغەمبەر (ﷺ) تەماشایەکی عائیشەی کرد وەك پێی بفەرموێت قسەت نیە؟ عائیشەش کەوتە وەڵامدانەوەی زەینەب تا بێدەنگی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) تەماشایەکی عائیشەی کرد و فەرمووی: ئەوە کچی ئەبووبەکرە.[10533]

---

[10531] - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٦٧٣، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢١٨٠٤، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٧١١١، صححه الذهبي في التلخيص.

[10532] - في تعليقاته على مسند أحمد بن حنبل.

١٠٥٣٣ - صحيح البخاري، الرقم ٢٤٦٢.

## له حەجی ماڵئاواییدا

جابیر (ﷺ) دەڵێت عەلی (ﷺ) که له یەمەنەوه هاتەوه، بینی فاطیمه ئیحرامی لابردووەو جلی رەنگاورەنگی لەبەرکردووه، عەلی لەسەر ئەوه سەرکۆنەی کرد و وتی کێ فەرمانی پێکردیت وابکەیت؟ فاطیمەش وتی باوکم فەرمانی ئەوەی پێکردم، عەلی چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و لەسەر ئەو کردەوەی فاتیمه پرسیاری کردو وتی که سەرکۆنەی فاطیمەم کرد لەسەر ئەو کارەی و ئەویش وتی باوکم فەرمانی ئەوەی پێکردم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (راستی وتووه، راستی وتووه، راستی وتووه، من فەرمانی ئەوەم پێکردووه).[١٠٥٣٤]

## لەکاتی وەفاتی باوکیدا

زەینەبی کچی ئەبوورافیع ئامادەی ساتەکانی نەخۆشکەوتنی پێش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) بووم، دەڵێت فاطیمەم بینی که حەسەن و حوسەینی هێنا بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوه دوو کوڕەکەتن، دەی میراتیان پێ ببەخشە، ئەویش فەرمووی حەسەن شکۆ و پێشەنگی منی بۆ هەیە، حوسەینیش بوێری و بەخشندەیی منی بۆ هەیە.[١٠٥٣٥]

خاریجەی کوڕی عوقوفان دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) له نەخۆشی سەرەمەرگیدا بوو که چووم بۆ لای و عارەقی دەکرد، فاطیمەش که ئەو حاڵەی دەبینی وتی باوکەڕۆ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (لەمڕۆ بەدوا نارەحەتی لەسەر باوکت نەما)،[١٠٥٣٦] ئەم بەسەرهاته له کتێبەکانی فەرموودەدا له ئەنەسی کوڕی مالیکیشەوه گێردراوەتەوه.[١٠٥٣٧]

عائیشه دەڵێت فاطیمەهات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) که دەچوو بەڕێدا دەتوت هەمان رێکردنی پێغەمبەره(ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی مەرحەبا له کچەکەم، ئینجا لای خۆیەوه داینیشاند، دواتر چپەیەکی بۆ کرد و فاطیمه گریا، وتم بۆچی دەگریت؟ دواتر پێغەمبەر (ﷺ) چپەیەکی تری بۆ کرد و فاطیمه دەستی کرد به پێکەنین، منیش وتم تا ئێستا نەمدیوه خەم و خۆشی ئاوا لەیەك نزیك بن، وتم

---

[١٠٥٣٤] - صحيح مسلم، الرقم ٢٢١٢.

١٠٥٣٥ - معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٧٠٢٤.

١٠٥٣٦ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٤.

١٠٥٣٧ - صحيح ابن حبان، الرقم ٦٧١٧، سنن ابن ماجة، الرقم ١٦٢٤، قال الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٦٢٩ حسن صحيح.

چۆن بوو واگریایت و دواتر پێکەنیت؟ فاتیمەش وتی نهێنی پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکرا ناکەم، دواتر کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، چووم هەمان پرسیارم کردەوە لە فاطیمە، ئەویش وتی چپاندی بە گوێمدا (جیبریل هەموو ساڵێك یەك جار قورئانی لەگەڵ دەور دەکردمەوە، ئەمساڵ دوو جار لەگەڵم دەوری کردەوە، وادەزانم ئەمە ئاماژەی مەرگمە، تۆیش یەکەم کەسیت بە من دەگەیتەوە)، منیش دەستم کرد بە گریان، دواتر فەرمووی (ئایا رازی نابیت تۆ گەورەی ژنانی بەهەشت –یان گەورەی ژنانی باوەڕداران– بیت؟) منیش بەوە پێکەنیم.[1038]

کاتێك تەرمی پێغەمبەر (ﷺ) خرایە ناو گۆڕەکەی و خۆڵی بەسەردا کرا، فاطیمە دەیوت ئەی ئەنەس چۆن دڵتان هات خۆڵ بکەن بەسەر پێغەمبەردا (ﷺ).[1039]

## پاش وەفاتی باوکی

پاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) و بەیعەتدان بە ئەبووبەکری صدیق، فاطیمەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) و عەبباسی مامی پێغەمبەریش (ﷺ) چوون بۆ لای ئەبووبەکرو داوای میراتییان کرد، ئەبووبەکریش پێی راگەیاندن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی دوای خۆی میراتی جێناهێڵێت و هەرچی جێهێشت ئەوە صەدەقەیە.[1040]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ)، فاتیمە داوای کرد لە ئەبووبەکر تا لە بەجێماوی پێغەمبەر (ﷺ) میراتی پێ بدات، ئەبووبەکر پێی وت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (چی بە میرات جێبهێڵین صەدەقەیە)، فاطیمە بەوە توورە بوو و دەنگی لە ئەبووبەکر وەرگرت و تا مرد هەروا بوو.[1041]

کاتێك فاطیمە نەخۆش بوو، ئەبووبەکر چوو بۆ لای و داوای مۆڵەتی کرد تا فاتیمە ببینێت، عەلی وتی ئەی فاطیمە ئەوە ئەبووبەکرە هاتووە بۆ لات و داوای مۆڵەت دەکات، ئەویش وتی حەز دەکەیت مۆڵەتی بدەم؟ عەلی وتی بەڵێ، فاطیمەش مۆڵەتی پێدا، ئەبووبەکر هاتە ژوورەوەو هەوڵی دەدا دڵی فاطیمە بهێنێتەوەو وتی سوێند بەخوا چی سامان و کەسوکار و عەشیرەتم وەلاناوە تەنها لەبەر

1038 - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٢٦.
1039 - أسد الغابة، ج٧، ص ٢٤٤.
١٠٥٤٠ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٣١٥.
١٠٥٤١ - صحيح البخاري، الرقم ٢٩٤٣.

ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەی و ڕەزامەندی ئێوەی ئالوبەیت بووە، ئیتر دڵی فاطیمەی دەهێنایەوە هەتا فاطیمە ڕازی بوو.[١٠٥٤٢]

فەرموودەیەك بە صەحیحی هاتووە کە مشتومڕێك لەسەر ڕوانینی هاوەڵان بۆ میراتی پێغەمبەر (ﷺ) دەخاتەڕوو، ڕووداوەکەش لە خیلافەتی عومەردا بووە، ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە:

مالیکی کوڕی ئەوس دەڵێت عومەری کوڕی خەططاب ناردی بە شوێن مندا، منیش چووم بۆ لای و ئەوکات خۆر لە بەرزایی ئاسمان بوو، دەبینم لەماڵەوە دانیشتووەو لەسەر پشتیەکی پێستە پاڵی داوەتەوە، پێی وتم ئەی مال-ناوەکەی کورت کردوەتەوە- خەڵکێ لە هۆزەکەت هاتن و منیش بەخششێکی کەمم کردن، بڕۆ لە نێوانیاندا دابەشی بکە، منیش وتم بریا کەسێکی ترت لەبری من ڕاسپاردایە، ئەویش وتی مالیك لێنەوە، ئینجا یەرفەء -پەردەدارەکەی عومەر- هات و وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران مۆڵەت دەدەیت عوثمان و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بێنە ژوورەوە؟ عومەر وتی بەڵێ، ئەویش مۆڵەتی پێدان و هاتنە ژوورەوە، ئینجا یەرفەء هاتەوەو وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران مۆڵەتی عەبباس و عەلی دەدەیت بێنە ژوورەوە؟ وتی بەڵێ، مۆڵەتی دا و ئەوانیش هاتنە ژوورەوە، عەبباس وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران لەنێوان من و ئەم درۆزنە تاوانبارە ناپاکە خیانەتکارەدا دادوەری بکە-مەبەستی عەلی بوو-، ئەوانەی لەوێ ئامادە بوون وتیان بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران دادوەری نێوانیان بکەو ڕەحم بەرامبەریان بنوێنە، -مالیك دەڵێت وام هاتە پێش چاو ئەو چوارەش بۆ هەمان شت هاتبوون بۆ لای عومەر-، عومەر وتی لەسەرخۆ بن، دواتر ڕوویکردەوە ئەو دەستەیە و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (میراتی جێناهێڵین، هەرچیمان جێهێشت صەدەقەیە)؟ وتیان بەڵێ، ئینجا تەماشای عەلی و عەبباسی کرد و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (میراتی جێناهێڵین، هەرچیمان جێهێشت صەدەقەیە)؟ وتیان بەڵێ، عومەر وتی دەی خوا تایبەتمەندیەکی بە پێغەمبەر (ﷺ) بەخشیوە کە بە هیچ کەسی تری نەبەخشیوە، خوا دەفەرموێت (وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٦

[١٠٥٤٢] - السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١١٩١٣ و قال إسناده صحيح.

)، لەوەش ئەوەی بەنو نەضیر بوو، دەی بەخوا تایبەتی نەکرد بە خۆی و بێبەشی نەکردن، پێغەمبەر (ﷺ) خەرجی سالێك یان خەرجی سالێکی خۆی و خێزانەکانی لێ هەلدەگرت و ئەوەی دەمایەوە لە رێی خوادا دەیبەخشی، ئینجا عومەر روویکردە ئەو چوارەی تر و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا ئەوە دەزانن؟ وتیان بەڵێ، ئینجا لایکرد بە لای عەلی و عەبباسدا و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا ئەم دوانەشتان ئەمە دەزانن؟ وتیان بەڵێ، عومەر وتی کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد ئەبووبەکر وتی من دۆست و وەلی پێغەمبەری خوام (ﷺ)، تۆ–عەبباسی دەدواند– و ئەمە–واتە عەلی– چوون بۆ لای ئەبووبەکر، تۆ میراتی برازاکەتت داوا دەکرد–واتە پێغەمبەر (ﷺ)– ئەمیش میراتی ژنەکەی–واتە فاطیمە– لە باوکیەوە –واتە پێغەمبەر (ﷺ)– داوا دەکرد، ئەبووبەکر وتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی (میراتی جێناهێڵێن، ئەوەی جێی دەهێڵێن صەدەقەیە)، کەچی ئەم دوانەتان واتاندەزانی درۆ دەکات و تاوانبار و ناپاکە، خواش دەزانێت راستگۆ و چاکەکار و ژیر و تێگەیشتوو بوو و شوێن حەق کەوتبوو، ئەوەبوو دەسەلاتی گرتەدەست، دواتر کە ئەبووبەکر وەفاتی کرد من وتم من دۆست و وەلی پێغەمبەر (ﷺ) و دۆست و وەلی ئەبووبەکرم، کەچی ئەم دوانەتان واتاندەزانی من درۆ دەکەم و تاوانبار و ناپاك و خیانەتکارم، خواش زانایە کە من راستگۆ و چاکەکار و ژیر و تێگەیشتوو و شوێنکەوتەی حەقم، ئەوەبوو دەسەلاتم گرتەدەست، ئینجا ئێستا تۆ و ئەمە و هەموو ئێوەش هاتون و قسەتان یەکەو لەو بارەوە پرسیار لە من دەکەن–واتە باری دەسەلات–، منیش دەلێم ئەگەر ئەم دوانەتان دەتانەوێت ئەوە بدەمە ئێوەو بەرامبەر بەوە بەڵێنی خواتان لەسەر بێت کە بەو جۆرەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری بوو لەسەری برۆن، لەسەر ئەوە لە منی وەربگرن و دواتر بێن بۆ لام و داوا بکەن بە بارێکی تر–جیا لەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری دەرۆیشت– دادوەری نێوانتان بکەم؟! نا بەخوا تا رۆژی دوایی جگە لەوە–کە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری دەچوو– دادوەری نێوانتان ناکەم، ئەگەریش دەرەقەتی ئەوە نایەن ئەوە بیدەنەوە دەست خۆم.[١٠٥٤٣]

لەم فەرموودەدا بۆمان دەردەکەوێت لەلایەکەوە هەموو ئەو هاوەلانە دانیان بەوەدا ناوە کە بیستوویانە لە پێغەمبەر (ﷺ) میراتێ جێناهێلێت و لەوەدا ئەبووبەکر لەسەر حەق بوو کە میراتی

---

١٠٥٤٣ - صحيح البخاري، الرقم ٢٩٤٤، صحيح مسلم، الرقم ٣٣٨٩ و اللفظ له، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٧١٢، سنن أبي داود، الرقم ٢٥٨٩، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٦١٢٧،

نەبەخشی بە فاطیمە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر بوونی کێشەی نێوان هاوەڵان و هەوڵدانیان بۆ چارەسەرکردنی، هەروەها عومەر لە هەڵوێستی عەلی و عەبباسەوە روانینی خۆی بۆ ئەو هەڵوێستەیان نیشانداوە کە لەوانەیە ئەوان ئەویش و ئەبووبەکریش بە درۆزن و ناپاك تەماشا بکەن، لەکاتێکدا بەپێی گێڕانەوەی تر کە باسمان کردووە ئەو گومانە نەبووە، بەڵام ئەم دەربڕینە هاوشێوەی ئەوەیە کەسێك کە بەرامبەرەکەی دەدوێنێت بۆ زیاتر سەلماندنی حەقبوونی دەڵێت هەرچەندە تۆ وادەزانیت من ئاواو ئاوەهام، لەلایەکەوە تا ئەگەر ناخی بەرامبەر شتێکی تێدا بێت رێی بۆ بکاتەوە تا ئاشکرای بکات، لەلایەکی تریشەوە تا پێی بڵێت من رام وایە تۆ وا بیر دەکەیتەوە.

## ئایا عومەر سکی فاطیمەی خستووە؟

جا مەسەلەیەکی تر کە لێرەدا باسکراوەو تەنها لە دەقە شیعیەکاندا هاتووە کە عومەری کوڕی خەططاب بۆ ئەوەی بە زۆر بەیعەت لە عەلی و فاطیمە وەربگرێت چووە تا ماڵیان بەسەردا بسووتێنێت و گورزی وەشاندووە لە فاطیمە و سکەکەی خستووەو بەو هۆیەشەوە فاطیمە وەفاتی کردووە، ئەمانە قسەی زۆر بیٚ بنەمان:

دەڵێن عەلی شێری خوایە، کەچی نەیوێراوە راستی خۆی نیشان بدات و بە ناچاری توقیەی بەکارهێناوەو بەیعەتی داوە بە ئەبووبەکر و عومەر و عوثمان.

دەڵێن پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیمامەتی بۆ عەلی دیاریکردووە، بەڵام هەموو هاوەڵان هەڵگەڕاونەتەوەو کوودەتایان کردووە بەسەر عەلیدا تەنها چەند هاوەڵێك نەبێت، وەك ئەوەی ئەو هەموو خوێندکارەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ناپاکی پەروەردە کرابن-پەنا بەخوا-.

دەڵێن عەلی شێری خوا و مەردی مەیدان بووە، بەڵام عومەر بەبەرچاویەوە هاتووە ماڵەکەی بسووتێنێت و شەقی داوە لە سکی فاطیمە و سکەکەی خستووەو بەو هۆیەشەوە مردووە، کەچی عەلی هیچی نەکردووەو دواتریش بەیعەتی داوە بە ئەبووبەکر و عومەریش.

دەڵێن عەلی زانیویەتی عائیشە ناپاك بووەو بە دوژمنی ئیسلامی زانیوە، کەچی کە عائیشەی کەوتووەتە دەست نەیکوشتووە و خزمەتی کردووە.

دەڵێن عەلی دوژمنی سەرسەختی عوثمان بووە چونکە عوثمان مافی داگیرکردووە، کەچی حەسەن و حوسەینی کوڕانی خۆی ناردووە بۆ ماڵی عوثمان تا بەرگری لیٚ بکەن.

ئەمەو دەیان نموونەی تر کە وا وێنای عەلی دەکەن –دوور بێت لەو هاوەڵە گەورە موژدەپێدراوەی بەهەشت– کەسێکی دووفاقی ترسنۆکی بێنازی بێ دەسەڵات بووبێت، لەکاتێکدا سەدان بەڵگە هەن وەڵامی ئەو ناراستیانە دەدەنەوە.

## کۆچی دوایی فاطیمە

فاطیمە پێنج مانگ یان شتێ لەو چەشنە دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) ژیاو لە تەمەنێکی کەمدا کۆچی دوایی کرد، دەوترێت تەمەنی بیست و چوار یان بیست و پێنج یان بیست و نۆ ساڵ بووە، بەڵام راستتر ئەوەیە تەمەنی بیست و چوار ساڵ بوو کە کۆچی دوایی کرد.[١٠٥٤٤]

راستتریش ئەوەیە شەش مانگ پاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد.[١٠٥٤٥]

فاطیمە پێش مردنی تووشی نەخۆشیەکی سەخت بوو، لەو کاتەشدا خەمی ئەوەی بوو کە چۆن ببرێت بەرەو گۆڕستان، ئەوەبوو کاتێك ئەسمائی کچی عومەیسی لابوو، بە ئەسمائی وت چەندە پێی ناخۆشە بە قوماشێکەوە ببرێت و جەستەی دەربکەوێت؟ ئەسمائیش وتی بەخوا دارەمەیتێکت بۆ دروست دەکەم وەك ئەوەی کە بینیم لە حەبەشە دروست دەکرا، فاطیمەش وتی ئادەی نیشانم بدە چۆنە، ئەویش بۆی دروست کرد، فاطیمەش پێکەنی، ئەوەش تاکە پێکەنینی بوو پاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ).[١٠٥٤٦]

کاتێ وەفاتی کرد عەلی هاوسەری تەرمەکەی شۆرد، بە شەو ئەسپەردە کرا و عەبباسی مامی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد و هەریەك لە عەلی هاوسەری و فەضل دابەزینە ناو گۆڕەکەی.[١٠٥٤٧]

بەڵام لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە عەلی خۆی نوێژی لەسەر کرد و بە شەو ئەسپەردەی کرد و ئەبووبەکری بانگ نەکرد.[١٠٥٤٨]

---

١٠٥٤٤ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٢١.

١٠٥٤٥ - صحيح البخاري، الرقم ٢٩٤٣.

١٠٥٤٦ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٧١٢،

١٠٥٤٧ - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٢٨.

١٠٥٤٨ - صحيح مسلم، الرقم ٣٣٩١.

ئەسمائی کچی عومەیس دەڵێت فاطیمە پێی وتم زۆرم پێ ناخۆشە کە قوماشێك دەدرێت بەسەر ئافرەتدا و جەستەی دەردەکەوێت، منیش وتم ئەی کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من لە حەبەشە شتێکم بینیوە با بۆت باس بکەم، ئەوەبوو بە برێ دار دارەمەیتێکی دروست کرد و ئینجا قوماشێکی دا بەسەریدا دا، فاتیمە وتی ئەمە زۆر چاکە، ئەگەر مردم تۆ و عەلی بمشۆن و کەسی تر نەیەتە ژوورەوە، ئەوەبوو کە وەفاتی کرد، عائیشە هات تا بێتە ژوورەوە، ئەسمائیش وتی مەیەرە ژوورەوە، عائیشە لای ئەبووبەکر سکاڵای کرد، ئەبووبەکر هات و وتی بۆ ریی نادەن؟ ئەسمائیش وتی فاطیمە خۆی فەرمانی کرد تەنها من و عەلی بیشۆین، ئەبووبەکریش وتی فاطیمە خۆی چۆنی وتووە وا بکەن.[١٠٥٤٩]

## پلەو پایەی فاطیمە

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: هیچ کەسم نەدیوە هێندەی فاطیمە هەڵسوکەوت و قسەکردنی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بچێت، هەرکات فاطیمە دەچوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەری هەڵدەسا و ماچی دەکرد و بەخێرهاتنی دەکرد و دەستی دەگرت و لە پاڵ خۆیدا دایدەنیشاند، هەرکاتیش پێغەمبەری خوا (ﷺ) بچوایە بۆ لای فاطیمە، فاطیمە لەبەری هەڵدەسا و ماچی دەکرد و دەستی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەگرت و ماچی دەکرد.[١٠٥٥٠]

پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (إن أفضل نساء أهل الجنة خديجة بنت خويلد و فاطمة بنت محمد و مريم بنت عمران و آسية بنت مزاحم إمراة فرعون)،[١٠٥٥١] (چاکترین ئافرەتانی بەهەشت بریتین لە خەدیجەی کچی خوەیلید و فاتیمەی کچی موحەممەد و مەریەمی کچی عیمران و ئاسیەی کچی موزاحیم کە ژنی فیرعەون بوو).

عائیشە دەڵێت لەکاتی نەخۆشکەوتنی پێغەمبەردا (ﷺ) فاتیمە هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کە دەچوو بەڕێدا دەتوت هەمان ڕێکردنی پێغەمبەرە (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی مەرحەبا لە

---

[١٠٥٤٩] - سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٢٨-١٢٩.

١٠٥٥٠ - سنن أبي داود، الرقم ٤٥٦١، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٧٧٨٤، صحيح ابن حبان، الرقم٧٠٦٣، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٨٩ وقال حسن صحيح، صححه الذهبي في التلخيص، كما صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٥٢١٧.

١٠٥٥١ - صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٢٠، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٧٧١، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٠٨٠، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٧٨٧، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٩٠٩، صححه الذهبي في التلخيص، كما صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ١٥٠٧.

کچەکەم، ئینجا لای خۆیەوە داینیشاندا، دواتر چپەیەکی بۆ کرد و فاتیمە گریا، وتم بۆچی دەگریت؟ دواتر پێغەمبەر (ﷺ) چپەیەکی تری بۆ کرد و فاتیمە دەستی کرد بە پێکەنین، منیش وتم تا ئێستا نەمدیوە خەم و خۆشی ئاوا لەیەك نزیك بن، وتم چۆن بوو واگریایت و دواتر پێکەنیت؟ فاطیمەش وتی نهێنی پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکرا ناکەم، دواتر کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، چووم هەمان پرسیارم کردەوە لە عائیشە، ئەویش وتی چپاندی بە گوێمدا (جیبریل هەموو ساڵێك یەك جار قورئانی لەگەڵ دەور دەکردمەوە، ئەمساڵ دوو جار لەگەڵم دەوری کردەوە، وادەزانم ئەمە ئاماژەی مەرگمە، تۆیش یەکەم کەسیت بە من دەگەیتەوە)، منیش دەستم کرد بە گریان، دواتر فەرمووی (ئایا رازی نابیت تۆ گەورەی ژنانی بەهەشت –یان گەورەی ژنانی باوەڕداران– بیت؟) منیش بەوە پێکەنیم.[١٠٥٥٢]

حوذەیفە دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (نَزَلَ مَلَكٌ مِنَ السَّمَاءِ فَاسْتَأْذَنَ اللَّهَ أَنْ يُسَلِّمَ عَلَيَّ لَمْ يَنْزِلْ قَبْلَهَا، فَبَشَّرَنِي أَنَّ فَاطِمَةَ سَيِّدَةُ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ)،[١٠٥٥٣] (فریشتەیەك لە ئاسمانەوە دابەزی و داوای مۆڵەتی کرد لە خوا تا سەلامم لێ بکات، پێشتر دانەبەزیبوو، موژدەی پێدام کە فاطیمە گەورەی خەڵکی بەهەشتە).

---

[١٠٥٥٢] - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٤٦.

[١٠٥٥٣] - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٦٦٩، صححه الذهبي في التلخيص.

## روقییەی کچی پێغەمبەر(ﷺ)

**دایکی ناوی خەدیجەی کچی خوەیلیدە، دایکی باوەڕداران و ژنی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، یەکەم کەس بوو باوەڕی هێنا بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ)، ئافرەتێکی دەوڵەمەند بوو کە سامانەکەی بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەکارهێنا، دایکی هەموو منداڵەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو جگە لە ئیبراهیم کە لە ماریە لەدایك بوو،[٥٩٨٨] چاکترینی ئافرەتانی بەهەشتە،[٥٩٨٩] سێ ساڵ پێش کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مەدینە کۆچی دوایی کرد.[٥٩٩٠]**

---

٥٩٨٤ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٦٣٠٤، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٣٠٩٩.

٥٩٨٥ - أسد الغابة، ج٢، ص ٢٨١.

٥٩٨٦ - أسد الغابة، ج٢، ص ٢٨١.

٥٩٨٧ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٨.

٥٩٨٨ - أسد الغابة، ج٧، ص ٨٨-٩٢.

٥٩٨٩ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥٧١، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٢٦٥٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٨٢٦، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٢٠، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٠٨٠، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٧٧١، صححه الذهبي في التلخيص، كما صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ١٥٠٨.

٥٩٩٠ - أسد الغابة، ج٧، ص ٩٥.

براكانی روقییە بریتی بوون لە قاسم كە برا گەورەی بوو، طەیب، طاهیر، عەبدوڵا،[5991] برایكی تری هەبوو بە ناوی ئیبراهیم كە لە سەری باوكیەوە بوو و دایكیان جیا بوو، ئیبراهیمیش لە ساڵی هەشتەمی كۆچیدا لەدایك بوو و پاش هەژدە مانگ هەر بە منداڵی كۆچی دوایی كرد،[5992] جا هەموو كوڕەكانی پێغەمبەر (ﷺ) لە خەدیجەوە پێش دابەزینی سروش وەفاتیان كرد، بەڵام كچەكانی مانەوە تا ئیسلام هات و باوەڕیان هێنا بە ئیسلام و لەگەڵ باوكیان كۆچیان كرد بۆ مەدینە.[5993]

سەبارەت بە خوشكەكانی

زەینەب خوشكی گەورەی روقییە و كچە گەورەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، بەڵام لە ساڵی هەشتەمی كۆچیدا وەفاتی كرد.[5994]

ئومموكلثوم كە لە روقییە بچووكتر بوو و دوای مردنی روقییەی خوشكی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی لە عوثمانی كوڕی عەففان مارە كرد، بەڵام ئەمیش لە ساڵی نۆی كۆچیدا وەفاتی كرد و باوكی (پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)) نوێژی لەسەر كرد.[5995]

خوشكێكی تری هەبوو ناوی فاطیمەی كچی موحەممەدی كوڕی عەبدوڵا بوو، كچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و[5996] گەورەی ژنانی بەهەشت[5997] و دایكی دوو رەیحانە و خۆشەویستەكەی پێغەمبەری

---

٥٩٩١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٤.

٥٩٩٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٧٢.

٥٩٩٣ - أسد الغابة، ج٧، ص ٩١.

٥٩٩٤ - أسد الغابة، ج٧، ص ١٤٤.

٥٩٩٥ - أسد الغابة، ج٧، ص ٤٢١.

٥٩٩٦ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٩.

٥٩٩٧ - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٤٦.

خوایه (ﷺ)،[5998] یەکەم کەسی ناو بنەماڵەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە دوای پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد.[5999]

سەبارەت بەوەی ئایا کچەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کامیان گەورەتر بوون، یەکدەنگی هەیە کە زەینەب کچە گەورە بووە، دواتر راجیایی هەیە، رایەك دەڵێت فاطیمە کچە بچووك بووە، رایەك دەڵێت: روقییە کچە بچووك بووە، رایەکیش دەڵێت بەڵکو ئوممو کلثوم کچە بچووك بووە.[6000]

روقییە هاوسەری کوڕێکی ئەبوو لەهەب بوو کە ناوی عوتبە بوو، ئەمەش پێش ماوەی پێغەمبەرایەتی بوو، بەڵام کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) سروشی بۆ هات و ئەبوولەهەب دژایەتی کرد، فەرمانی کرد بە کوڕەکەی تا روقییە تەڵاق بدات، ئەوکات هێشتا روقییە نەگوازرابوویەوە، ئەوەبوو تەڵاقی دا، دواتر عوثمانی کوڕی عەففان روقییەی بەهاوسەر گرت و لەگەڵیدا خۆشی و ناخۆشیەکانی بەشکرد، پێکەوە کۆچیان کرد بۆ حەبەشەو پێکەوە گەڕانەوەو کۆچیان کرد بۆ مەدینەو لە مەدینەش تا وەفاتی روقییە عوثمان هەر لە لای روقییە بوو.[6001]

کاتێك عوثمان و روقییە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، پێغەمبەر (ﷺ) ماوەیەك هەواڵی ئەوانی نەزانی، هەوڵی دەدا هەواڵیان بزانێت، ئەوەبوو ئافرەتێك هات بۆ لای و هەواڵی عوثمان و روقییەی پێ بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إن عثمان أول من هاجر إلى الله بأهله بعد لوط)،[6002] ( عوثمان یەکەم کەسە دوای پێغەمبەر لووط لەپێناو خوادا بە خۆیو ژنیەوە کۆچی کردبێت).

روقییە لە عوثمانی کوڕی عەففان کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا، بەڵام ئەو کوڕەی مرد و ئیتر دوای ئەوە روقییە منداڵی تری نەبوو،[6003] عەبدوڵای کوڕی تەمەنی گەیشتبوویە شەشساڵان کە کەڵەشێرێك دەنووکی دا لە دەموچاوی و مرد.[6004]

---

٥٩٩٨ - صحيح البخاري، الرقم ٣٥٦٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٠٧٩، سنن الترمذي، الرقم ٣٧٨٨، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٢٥٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٧٥٣، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٥٦٠٦، مسند الطيالسي، الرقم ٢٠٢٥، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٨١٥.

٥٩٩٩ - صحيح البخاري، الرقم ٤١٧٩، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٩٠.

٦٠٠٠ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٨.

٦٠٠١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٨-٦٤٩.

٦٠٠٢ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٤١.

٦٠٠٣ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٨-٦٤٩.

## کۆچی دوایی روقییه:

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو بۆ غەزای بەدر روقییە نەخۆش بوو، بۆیە عوثمانی کوڕی عەففان لای روقییەی خێزانی مایەوە، ئەو رۆژەی زەیدی نێردراوی پێغەمبەر (ﷺ) بە موژدەوە هاتەوە بەرەو مەدینە تا هەواڵی سەرکەوتنی بەدر بدات، روقییە کۆچی دوایی کرد.[٦٠٠٥]

مانەوەی عوثمان لای روقییەو نەچوونی بۆ غەزای بەدر بە فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو.[٦٠٠٦]

کاتێك عوثمان و هاوەڵان سەرقاڵی ئەسپەردەکردنی تەرمی روقییە بوون، عوثمان دەنگێکی الله أکبری بیست، وتی ئەی ئوسامە ئەوە چیە، کە تەماشایان کرد زەیدی کوڕی حارثەیە لەسەر وشترەکەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و هەواڵی شکستی بێباوەڕانی پێیە.[٦٠٠٧]

کاتێك روقییە وەفاتی کرد پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (الحقي بسلفنا عثمان بن مظعون)، (پەیوەست بە بە پێشینمان عوثمانی کوڕی مەظعوون)، پێشتر کە عوثمانی کوڕی مەظعوون وەفاتی کردبوو، ژنەکەی وتی بەهەشتت لێ پیرۆز بێت، پێغەمبەر (ﷺ) بە تووڕەییەوە تەماشای کرد و فەرمووی: تۆ چووزانیت؟ ئەویش وتی ئەو سوارچاك و هاوەڵی تۆ بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەخوا نازانم چی پێ دەکرێت)، ئیتر هاوەڵان ئەوەیان زۆر لەسەر سەخت بوو کە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) بۆ عوثمان وای فەرموو، بەڵام کاتێك روقییە مرد و پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی فەرموو ئیتر هاوەڵان تێگەیشتن.[٦٠٠٨]

ژنان بۆ مەرگی روقییە دەگریان و عومەری کوڕی خەتتابیش ڕێگری دەکرد لێیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: وازبێنە ئەی عومەر، پاشان فەرمووی: (إياكن ونعيق الشيطان، فإنه مهما يكون من العين والقلب فمن الرحمة، وما يكون من اللسان واليد فمن الشيطان)، (خۆدوور بگرن لە قیژەی شەیتان، چونکە تا لە چاو و دڵەوە بێت ئەوە لە ڕەحم و سۆزەوەیە، ئەوەش لە زمان و دەستەوە بێت ئەوە لە

---

٦٠٠٤ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٥١.

٦٠٠٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٩.

٦٠٠٦ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٣٤٧.

٦٠٠٧ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٩.

٦٠٠٨ - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٨١٩٣، مسند الطيالسي، الرقم ٢٨٠٧.

**شەیتانەوەیە)، فاطیمەی خوشکی لە کەناری گۆڕی روقییەوە بۆ روقییەی خوشکی دەگریا، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) بە لایەکی جلەکەی فرمێسکی چاوانی فاطیمەی دەسڕی.**[٦٠٠٩]

**لەبەرئەوەی کاتێك روقییە وەفاتی کرد پێغەمبەر (ﷺ) لە بەدر بوو، دیارە ئەو رووداوانە دوای هاتنەوەی بووە لە بەدر.**

---

٦٠٠٩ - مسند الطيالسي، الرقم ٢٨٠٧، قال الذهبي هذا منكر.

# زەینەبی کچی پێغەمبەر(ﷺ)

ناوی زەینەبە و کچی موحەممەد پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، کۆتای پێغەمبەران و پێشەوای مرۆڤایەتی بۆ هەتاهەتایە، کچە گەورەی خۆشەویستی مرۆڤایەتی و خۆشەویستی ئازیزی هەموو موسڵمانان، ئەو کچەی کە لەبەر بانگەوازەکەی باوکی زۆرترین نارەحەتی و ئەشکەنجەی دەروونی و جەستەیی چەشت.

دایکی ناوی خەدیجەی کچی خوەیلیدە، دایکی باوەڕداران و ژنی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، یەکەم کەس بوو کە باوەڕی هێنا بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئافرەتێکی دەوڵەمەند بوو کە سامانەکەی بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەکارهێنا، دایکی هەموو منداڵەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو جگە لە ئیبراهیم کە لە ماریە لەدایك بوو،[٦٣٢٨] چاکترینی ئافرەتانی بەهەشتە،[٦٣٢٩] سێ ساڵ پێش کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مەدینە کۆچی دوایی کرد.[٦٣٣٠]

---

٦٣٢٦ - تاريخ مدينة دمشق، ج١٩، ص ٢٥٨.

٦٣٢٧ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٦٧.

٦٣٢٨ - أسد الغابة، ج٧، ص ٨٨-٩٢.

براکانی زەینەب بریتی بوون لە قاسم کە برا گەورەی بوو، طەیب، طاهیر، عەبدوڵا،[٦٣٣١] برایەکی تری هەبوو بە ناوی ئیبراهیم کە لە رووی باوکیەوە بوو و دایکیان جیا بوو، ئیبراهیمیش لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا لەدایك بوو و پاش هەژدە مانگ هەر بە منداڵی کۆچی دوایی کرد،[٦٣٣٢] جا هەموو کوڕەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خەدیجەوە پێش دابەزینی سروش وەفاتیان کرد، بەڵام کچەکانی مانەوە تا ئیسلام هات و باوەڕیان هێنا بە ئیسلام و لەگەڵ باوکیان کۆچیان کرد بۆ مەدینە.[٦٣٣٣]

سەبارەت بە خوشکەکانی

روقییە کە خوشکی بچووکی بوو و هاوەری عوثمانی کوڕی عەففان بوو و پاش کۆچکردن بۆ مەدینە لە کاتی غەزای بەدردا کۆچی دوایی کرد.[٦٣٣٤]

ئوممولکلثوم کە لە روقییە بچووکتر بوو و دوای مردنی روقییەی خوشکی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی مارە کرد لە عوثمانی کوڕی عەففان، بەڵام ئەمیش لە ساڵی نۆی کۆچیدا وەفاتی کرد و باوکی (پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)) نوێژی لەسەر کرد.[٦٣٣٥]

خوشکێکی تری هەبوو ناوی فاطیمەی کچی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا بوو، کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و[٦٣٣٦] گەورەی ژنانی بەهەشت[٦٣٣٧] و دایکی دوو رەیحانە و خۆشەویستەکەی پێغەمبەری

---

٦٣٢٩ - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥٧١، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٢٦٥٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٨٢٦، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٢٠، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٠٨٠، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٧٧١، صححه الذهبي في التلخيص، كما صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ١٥٠٨.

٦٣٣٠ - أسد الغابة، ج٧، ص ٩٥.

٦٣٣١ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٤.

٦٣٣٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٧٢.

٦٣٣٣ - أسد الغابة، ج٧، ص ٩١.

٦٣٣٤ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٨٣٩ – ١٨٤٣.

٦٣٣٥ - أسد الغابة، ج٧، ص ٤٢١.

٦٣٣٦ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٩.

٦٣٣٧ - صحيح البخاري، الرقم ٣٤٤٦.

خوایە (ﷺ)،[٦٣٣٨] یەکەم کەسی ناو بنەماڵەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە دوای پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد.[٦٣٣٩]

سەبارەت بەوەی ئایا کچەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کامیان گەورەتر بوون، یەکدەنگی هەیە کە زەینەب کچە گەورە بووە، دواتر راجیایی هەیە، رایەك دەڵێت: فاتیمە کچە بچووك بووە، رایەك دەڵێت: روقییە کچە بچووك بووە، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو ئومموکلثوم کچە بچووك بووە.[٦٣٤٠]

رایەك دەڵێت: کاتێك زەینەب لەدایك بوو تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) نزیکەی سی ساڵ دەبوو، واتە دەساڵ پێش دابەزینی سروش بۆی، بەو پێیە کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) سروشی بۆ دابەزیوە تەمەنی زەینەب دە ساڵان بووە.[٦٣٤١]

زەینەب لەگەڵ ئەبولعاصی کوڕی رەبیعدا هاوسەرگیری کرد کە پوورزای زەینەب و خوشکەزای خەدیجەی دایکی باوەڕداران بوو، بەڵام ئەبولعاص موسڵمان نەبوو، هەر بۆیە ئامادە نەبوو لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کۆچ بکات بۆ مەدینە و بە بێباوەڕی لە مەککە مایەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەینەبی نەگێڕایەوەو لای مێردەکەی خۆی هێشتیەوە و فەرمانیشی نەکرد زەینەب کۆچ بکات بۆ مەدینە.[٦٣٤٢]

سەبارەت بە کاتی هاوسەرگیریەکەیان، ذەهەبی دەڵێت: ئیبن سەعد دەڵێت: پێش ئەوەی سروش دابەزێت هاوسەرگیرییان کردووە، بەڵام ئەوە زۆر دوورە لە راستیەوە.[٦٣٤٣]

قسەکەی ذەهەبیش راستە، چونکە زەینەب لەکاتی دابەزینی سروشدا تەمەنی تەنها دە ساڵان بووە، جا ئەگەر پێش ئەوە بەهاوسەر گیرابێت ئەوە تەمەنی کەمتر لە دە ساڵان دەکات، بەڵام راستتر ئەوەیە دوای دابەزینی سروش بەهاوسەر گیراوە.

---

٦٣٣٨ - صحيح البخاري، الرقم ٣٥٦٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٠٧٩، سنن الترمذي، الرقم ٣٧٨٨، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٢٥٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٧٥٣، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٥٦٠٦، مسند الطيالسي، الرقم ٢٠٢٥، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٨١٥.

٦٣٣٩ - صحيح البخاري، الرقم ٤١٧٩، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٩٠.

٦٣٤٠ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٨.

٦٣٤١ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٦٥.

٦٣٤٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٦٥.

٦٣٤٣ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٤٦.

ئەبولعاصی مێردی زەینەب لە جەنگی بەدردا لەناو ریزی بێباوەڕاندا بەشداری کرد و دواتر بەدیل گیرا، ئینجا عەمری برای هات تا بە پارە ئازادی بکات، زەینەب گەردن بەندێکی لابوو کە هی خەدیجەی دایکی بوو و کاتێك زەینەب شووی کرد بە ئەبولعاص خەدیجەدا بووی بە زەینەب، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی بینی ناسیەوەو خەدیجەی بیر کەوتەوەو سۆزی بۆی جوولا و خەڵکەکەی دواند و خەڵکەکە رازی بوون تا ئەبولعاص ئازاد بکرێت، ئینجا گەردنبەندەکەی گێڕایەوە بۆ زەینەب و مەرجی لەسەر ئەبولعاص دانا تا واز لە زەینەب بهێنێت، ئەویش رازی بوو، ئیتر زەینەب کۆچی کرد بۆ مەدینە.[٦٣٤٤]

لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) نموونەی خەزووری تێگەیشتوو و دڵسۆز و وێنەی باوکی خەمخۆر دەبینین، پێغەمبەر (ﷺ) هەرچەندە دەیزانی زاواکەی بێباوەڕە، دەیزانی زاواکەی هاتووە تا دژایەتی دینی خوا بکات و بەرامبەر سوپایەك وەستاوە کە خەزووری سەرکردەیەتی، کەچی پاش ئەوەش کە بەدیلی دەگرێت، هێشتا ئامادە نیە سزای بدات، تەنها مەرجی لەسەری ئەوەیە کە واز بهێنێت لە زەینەبی کچی بێتەوە بۆ لای، ئەویش نەك بە تەڵاق، بەڵکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیهێشت تەڵاق بکەوێتە نێوانیانەوە، دواتریش دوای ئەوەی زەینەب هاتەوە مەدینە جارێکی دی ئەبولعاصی مێردی بەدیل گیرا، کەچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووبارە چاکەی لەگەڵ نواند و ئازادی کرد، جا کوان ئەو خەزوور و باوکانەی ئەمڕۆ کە خۆ بە شوێنکەوتەی پێغەمبەر (ﷺ) دەزانن تا بە جوانی رامێنن لەم بەسەرهاتە نەك تەنها وەك رووداوێك بیخوێننەوەو بەسەریدا تێپەڕ بن.

لە گێڕانەوەی تردا هاتووە کە زەینەب خۆی کەسی نارد بۆ ئازادکردنی ئەبولعاصی مێردی و پارەی بە کەسەکەدا نارد، لەگەڵیشیدا گەردنبەنەدەکەی نارد.[٦٣٤٥]

دوای ئەوەی ئەبولعاص لە بەدر ئازاد بوو و گەڕایەوە، بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر و دەرفەتی زەینەبی دا بچێت، زەینەبیش کۆچی کرد بۆ مەدینە بۆ لای باوکی.[٦٣٤٦]

لە رێی کۆچکردنەکەیدا هەبباری کوڕی ئەسوەد رێی پێگرت و بە رمێك دای لە سوارەکەی زەینەب و زەینەبیش لەسەر سوارەکەی کەوتە خوارەوە.[٦٣٤٧]

---

٦٣٤٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٦٥.

٦٣٤٥ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٣١٢.

٦٣٤٦ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٧٨.

کاتێك زەینەب کەوتەڕێ بۆ کۆچەکەی لەگەڵ کینانیەکان چوو، خێرا کۆمەڵێك کەوتنە شوێنی تا ئازاری بدەن، لەوانە هەبباری کوڕی ئەسوەد بوو کە ئەو هەڵوێستەی نواند، ئەوکات زەینەب سکی هەبوو، بەو کەوتنەی سکەکەی خست و خوێنیشی لێ ڕۆیشت، لەسەرئەوە هاشمی و ئومەویەکان کەوتنە دەمەبۆڵەو هەرکام دەیانوت ئێمە نزیکترین لێیەوە، ئەوەبوو زەینەب برایەوە بۆ لای هیندی کچی عوتبە، هیند پێی دەوت هەموو ئەم بەزمانە لەبەر باوکتە، پێغەمبەر (ﷺ)زەیدی کوڕی حارثەی نارد بە شوێنیدا و فەرمووی: (دەتوانیت بچیت زەینەبم بۆ بهێنیت؟)، ئەویش وتی بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی خاتەمەکەم ببە، زەید چوو و بە وشترەکەیەوە نزیك بوویەوە تا گەیشت بە شوانێك، وتی شوانەی کێیت؟ ئەویش وتی هی ئەبولعاصم، وتی ئەی ئەو مەڕانە هی کێن؟ وتی هی زەینەبی کچی موحەممەدن، زەید لەگەڵیدا چوو، دواتر بە شوانەکەی وت ئەگەر شتێکت بدەمێ دەیگەیەنیتە دەستی زەینەب بەلام لای کەس باسی نەکەیت؟ وتی بەڵێ، زەید خاتەمەکەی پێدا، کابرای شوانە چوویەوەو مەڕەکانی کردەوە شوێنی خۆیان و خاتەمەکەی دا بە زەینەب، زەینەبیش خاتەمەکەی ناسیەوەو وتی کێ ئەمەی پێدایت؟ شوانەکە وتی کابرایەك، زەینەب وتی ئەی لەکوێ جێتهیشت؟ وتی لە فلانە شوێن، زەینەبیش بێدەنگ بوو تا شەو هات، ئینجا چوو بۆ لای زەید، کە گەیشتە لای زەید، زەید وتی (سەرکەوە لەپێش منەوە دابنیشە)، زەینەب وتی نەخێر تۆ سەرکەوەو لەپێش منەوە دابنیشە، زەینەب لە دواوەو زەید لە پێشیەوە بەسەر وشترەکەوە چوونەوە بەرەو مەدینە، پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (ئەمە چاکترین کچمە کە لەبەر من تووشی نارەحەتی بوو).[٦٣٤٨]

لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا پێغەمبەر (ﷺ) سریەیەکی نارد تا هێرش ببەنە سەر کاروانێکی قوڕەیشیەکان، لەناو کاروانەکەدا ئەبولعاص بەدیل گیرا و هێنرایەوە مەدینە، ئەبولعاص چوویە لای زەینەب تا پەنای بدات، ئەویش پەنای دا، پێغەمبەری خوایش (ﷺ)بە پەنادانەکەی زەینەب رازی بوو، ئینجا زەینەب داوای کرد چی لێ سەنراوە بۆی بگێردرێتەوە، ئەوەشی بۆ کرا، ئەبولعاص گەڕایەوە مەککەو چی سپاردەی خەڵکی لابوو گێڕایەوە و دواتر لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا گەڕایەوە بۆ مەدینەو

---

٦٣٤٧ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٣٥.

٦٣٤٨ - المستدرك على الصحيحين، الرقم ٢٧٤٤، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٨٥٨، صححه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٣٠٧١.

**لەوێ موسڵمان بوو و زەینەبی خێزانیشی بوویەوە بە هاوسەری،[6349] هاوسەرگیریەکەشیان هەر لەسەر بنەمای ئەو هاوسەرگیریەی یەکەم بوو نەك سەرلەنوێ مارە بکرێتەوە.[6350]**

**زەینەب لە ئەبولعاص کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەلی کە هەر بە هەرزەکاری وەفاتی کرد،[6351] کچێکیشی هەبوو بە ناوی ئومامە کە پێغەمبەر (ﷺ) زۆری خۆشدەویست، تەنانەت کە نوێژی دەکرد ئومامەی دەگرتەباوەش، کە دەچوو بە سوجدەدا دایدەنا، کە هەڵدەسایەوە هەمدی دەیگرتەوە باوەش.[6352]**

**جارێك پێغەمبەر (ﷺ) دیاریەکی بۆ هات کە گەردنبەندێك بوو، فەرمووی دەیدەم بە خۆشەویسترین کەسی ناو بنەماڵەکەم، پێغەمبەر (ﷺ) ئومامەی کچی زەینەبی بانگ کرد و کردیە گەردنی.[6353]**

**دوای ئەوەی فاطیمەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، عەلی کوڕی ئەبوو تالیب ئومامەی کچی زەینەبی بەهاوسەرگرت کە خوشکەزای فاطیمە بوو،[6354] ئەمەش لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکر صدیق و پاش جەنگی یەمامە بوو.[6355]**

**زەینەب لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا وەفاتی کرد، زۆری نەخایاند کە ئەبولعاصی مێردیشی کۆچی دوایی کرد.[6356]**

**کاتی مردنەکەشی لە سەرەتای ساڵی هەشتەمی کۆچیەوە بوو،[6357] کاتێك ویستیان تەرمەکەی بشۆن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بە سیدر–گەڵای دارێکە– بیشۆن، بە تاکیش بیشۆن، سێ جار یان بە پێویستتان زانی پێنج جار بیشۆن، پاشان بە کافوور–بۆنێکی خۆشە لە دارێك– بۆنخۆشی بکەن، کە**

---

٦٣٤٩ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٦٥.

٦٣٥٠ - سنن أبي داود، الرقم ١٩٢٦، صححه الألباني في التحجيل في تخريج ما لم يخرج من الأحاديث و الىثار في إرواء الغليل(٦٠/١).

٦٣٥١ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٤٦.

٦٣٥٢ - صحيح البخاري، الرقم ٥٠٣، صحيح مسلم، الرقم ٨٧٦، سنن أبي داود، الرقم ٧٩٥،

٦٣٥٣ - مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٤١٥١، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

٦٣٥٤ - سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٤٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٠٢.

٦٣٥٥ - البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٥٣.

٦٣٥٦ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٦٥.

٦٣٥٧ سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٥٠.

تەواو بوون بانگم بکەن)، کە تەواو بوون پێغەمبەر (ﷺ) چوویە ژوورەوەو جلەکەی خۆی فرێدا بۆ ئەوانەی تەرمەکەیان شۆردبوو، قژەکانی زەینەبیان کرد بە سێ پەلکەو خستیانە پشتیەوە.[٦٣٥٨]

---

٦٣٥٨ - صحيح البخاري، الرقم ١٢١٦.